گۆران سەباح

# ٢ی سوور

رۆمانێك لە بارەی

تووڕەیی گەل و وزەی خۆشەویستی و هونەر و ئیمان

گۆران سەباح

٢ی سوور

ژانری ئەدەبی: فیکشن

هەڵەگری: کاروان سەباح و کارمەند خدر

تابلۆی بەرگ: باڵا بێجان

فۆتۆی بەرگ: گەیلان حاجی

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

چاپخانەی رۆژهەڵات

چاپی یەکەم، ٢٠١٣

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە (٧٧١)ی

ساڵی ٢٠١٣ دراوەتێ

## گۆران سەباح باشتر بناسە

گۆران سەباح نووسەر، وەرگێڕ و رۆژنامەنووس، نووسەری رۆمانی "شاخوێنبەری سەرکردە" و رۆمانی و "ترس و رق"ە. "شاخوێنبەری سەرکردە" لە ساڵی ٢٠٠٥دا چاپی یەکەمی لە چاپخانەی نازە کرا. دووەمیش لە ٢٠١٠ لە هەمان چاپخانە. رۆمانی دووەمی گۆران سەباح بەناوی "ترس و رق" ە دەزگەی موکریانی لە ٢٠١٣دا چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

گۆران سەباح دەیان وتار و کورتیلە چیرۆکی بڵاوکراوەی هەیە. وەك باکگراوندی نووسین تا ئێستە خاوەن سێ رۆمانە بە "٢ی سوور"یشەوە. گۆران سەباح هەڵگری باشترین وەرگێڕە لە کوردستان لە فیستیڤاڵی لاوی ساڵی ٢٠٠٩. وەك باکگراوندی وەرگێڕ تا ئێستە ٢٤ کتێبی لە ئینگلیزییەوە کردووەتە کوردی، لیستی کتێبە وەرگێڕاوەکان لە کۆتاییدا ببینە.

گۆران سەباح دبلۆم لە ئاژانسی هەواڵ لە ئەڵمانیا (٢٠٠٨) و ماستەر لە راگەیاندن لە ئەمەریکا لە ٢٠١٠ ی هەیە. وەك باکگراوندی رۆژنامەوانی، گۆران دەستەی دامەزرێنەری ئاکانیوز بوو، هەروەها لە چەندان بەلاڤۆکی ناوخۆ و بیانیدا کاری کردووە.

راهێنەرێکی رۆژنامەوانی دیارە لە ناو کایەی رۆژنامەوانیدا کە تا ئێستە چەندان رۆژنامەوانی گەنجی پێگەیاندووە. خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری گۆڤاری ئادمەگەزین بوو لە ساڵی ٢٠٠٨–٢٠١٠ کە یەکەمین گۆڤاری هونەر و رێکلامی سەربەخۆ بوو.

لە ١٨ ئابی ٢٠١٣دا، گۆران لە زانکۆی کانزەس، شاری لۆرێنس، لە ویلایەتی کانزەسی ئەمەریکی وانەی "میدیا و کۆمەڵگا" و "نووسینی میدیایی" دەڵێتەوە، هاوکات، قوتابی دکتۆراشە هەر لە هەمان زانکۆ لە بواری میدیا.

نووسەر خەڵکی شاری هەولێرە و قۆناخەکانی خوێندنی، بە کۆلیجیشەوە، هەر لە هەولێر تەواو کردووە.

## وتەیەك

شێرزاد حەسەن

"دووی سوور" تازەترین رۆمانی " گۆران سەباح"ە کە ناکرێت وەك رۆمانێکی بێ کێشە تەماشای بکەین، چ وەك فۆرم و تەلارسازی و چ وەك مانا و ناوەرۆك، کارەکتەرەکانی لە نێوان ئایکۆن و مرۆڤی راستەقینەدا وێڵمان دەکەن، کە نووسەر ناوی ناون پەیکەر: پەیکەری هەموو دۆخەکان و دیاردەکان، چ دزێو و چ ناشیرین، نێگەتیڤ یان پۆزەتیڤ: نموونەی پەیکەرەکانی خوێن، جووڵە، درۆ، پارە، گومان، خۆشەویستی، چڵێسی، سەرخۆشی، نەزانی، ئیمان... هتد.. کە هەر هەمووشیان وەك ئایکۆنی دۆخ و دیاردە و ئایدیایەك، رەش بێت یان سپی، لە ناوئاخنی تێکستەکەدا شی دەکرێنەوە.

رەنگە فەزا فانتازیاکەی کە زێدە خەیاڵ بڵاوی تێدایە لێنەگەڕێت بە مەنتق و واقیعێکی کۆنکریتی چێژ لەم دەقە ببینین، بۆ من پتر وەك ناو بە دەقێکی کراوەی تێدەگەم تا رۆمان، هەر چەندە رۆمانی تازە فۆرمێکی پیرۆزی نەماوە و لق و پۆپی زۆری

لێدەبێتەوە، بۆیە نووسەر ئازادە ناو لە تێکستەکەی بنێت رۆمان یان نارۆمان یان دەرە رۆمان و میتارۆمان. مێژووی ئەدەبی داستانی تازە لای خۆمان لە سەدەیەك تێپەڕی نەکردووە، لە هەنووکەدا هەمووومان ئەزموونکارین، کە پتر خۆتاقیکردنەوەیە تاوەکو جێگیربوون.

رۆمانەکە بە خوێن دەست پێدەکات و هەر بە خوێن کۆتایی دێت کە بە هەق تۆماری مێژووی ئیمەیە، شوێن: " شازلاند"ە کە ناوەکە گوزارشتە لە شێواوی و ناتەبایی و نائاسایی بوون. جیهانێکی تەواو نامۆ و خەونئامێز، نووسەر ناچار نەبووە رێز لە توخم و پایە کلاسیکییەکانی رۆمان بگرێت، دونیایەکی سوریالی، زمانێکی زبر و توورە و بریندارکەر وەك واقیعی کارەساتئامێزی ناو دەقەکە خۆی، وەك تابلۆیەکی ئەبستراکت دەیبینم، گەرچی زەمەن لە نێوان ئێستا و رابردوودا پتر جۆلانێ دەکات، بەڵام جاروبار هەڵماندەداتە داهاتوو، لە ناو ئەو زەمەنەدا تەنها دەنگی زاڵ هەر بە تەنیا هەقایەتخوانێکە کە دەکرێت نووسەر بێت یان کەسێکی دیکە.

پاڵەوانی هەمیشە نادیار کەڵەگا و برا گەورە و دکتاتۆرە، وەك خودا زاڵ، جیهانێکی جەهەننەم ئاسای بۆ مەردوومەکان ساز

کردووە، کە لەوە دەچێت لە دوا دیمەندا هەمووان لێی هەڵبگەڕێنەوە.

لەم ڕۆمانەدا ناوی کەسەکان و شارەکانیش ڕەمز و ڕەهەندێکی تەعبیریان هەیە کە پتر گەمەی هێما و نیشانەبازییە بۆ مانا شاراوەکان کە لە ناوئاخندا قسەکردنە لەسەر مێژووی گەندەڵبوون. مانیفێستێکی تووڕەیە لە بەرامبەر واقیعی تاڵی رامیاری و کۆمەڵایەتی. جیهانێکە هەر هەمووی لە لایەن "دووی سوور"ەوە داگیر کراوە، کە پتر ڕۆمانی " ١٩٨٤" ی جۆرج ئۆروێڵ ـ مان دێنێتەوە یاد کە تیایدا برا گەورە چاودێری هەر هەموو کەسەکان و شتەکان دەکات.

پانتایی تراژیدی ئەوەندە بەرینە کە تەنها لە بەشی " پەیکەری خۆشەویستی" بەر دیمەونێکی ئیرۆتیکی دەکەوین، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە دێت کە تۆماری ڕۆژگاری داڕووخانی ئەخلاقی زاڵترە، بۆیە نووسەر لەودیو ئەم تێکستەوە پەیامێکی ڕەوشتپارێزی هەیە. هەر لەبەر ئەوەشە کە نووسەر لە پشت ڕۆحێکی ئەلیگۆری خۆی حەشارداوە کە کۆی بەرهەمەکە لە بازنەی ڕەمز و ڕەمزکاری قورتاری نەبووە.ئەوەیان چیرۆکی کەوتنی هەموو ڕەمزەکانی شۆڕشە وەك نموونەی "شاخبڕ و کاك روکن". شۆڕشێك بووە دژی بەهاکان و هونەریش خۆی وەك لە پاڕی "

پەیکەری موزیك"دا خۆی دەنوێنێت. کرۆکی دەقەکە گومانکردنە لەوەی سیاسەت گەمەی بە گەمژەکردنی مرۆکانە، چونکە پیرۆزی سەرۆك و دەستەلات ناهێڵێت کەس ئاوەزی هەبێت بیر بکاتەوە، چونکە سەرۆك لە باتی هەر هەمووان بیر دەکاتەوە.

دوا جار رق و تووڕەیی پیرۆزی خەڵکی ژێر دەستە لە قەلاوە وەك تۆفان هەڵدەستێت و هەموو رەمزەکانی ستەم رادەماڵێت، گەرچی هیچ ئاماژەیەك نیە بمانباتەوە سەر رێگای سەرفرازی و دڵنیایی لە سەرکەوتنی شۆرشێکی وەها سوور.

# ١

لە ٢/ ٢/ ٢٠٢٢دا، ئاپۆرەیەکی سوور لەسەر قەڵای شاری زیندووان لە وڵاتی شازلاند کۆ دەبنەوە. قەڵا وەك ئێستە نابێ: سەوز لە کژی بەهاران و زەرد و وشك لە پایزان. قەڵا وەك جەستەیەکی خوساو لە خوێن، تك تك خوێنی لێ دەچۆڕێتەوە و سوور سوور دەبێ. دار، دیوار، زەوی، شەقام، تەنانەت دیواری مزگەوتی قەڵاش سوور دەکرێ. ئەگەر بە کۆپتەرێك لە سەرەوە وێنەیەکی قەڵا بێتە گرتن، تەنیا رەنگی مۆر، سەوز، زەرد و سپیی ئاڵای شازلاند دەردەچێ، تەواوی شتەیلی تر، هەر هەموویان، سوور دەردەچن. ئەگەر بیر لە ساڵانی هەشتاکان بکەیتەوە، قەڵا وەك دەریایەك لە خوێن دێتە پێش چاو: خوێنی شەهیدان وەك بڵێی لە حەژمەتاندا مەییی بێ و قەتماخە لەسەر قەتماخ، چین چین قەڵایەکیان دروست کرد بێ. ئەگەر ساڵانی دوای راپەڕینیش بێنیتە بەرچاو، قەڵا وەك تۆپەڵە خوێنێکی کەوتووی دایك دەبێ وەك بڵێی شازلاندی لەبار چوو بێ یان لەباریان برد بێ.

نیوەی خەڵکی شاری زیندووان و دەوروبەری، سێچارەکی شاری مەستی و نیوەی شاری (مەنگ)یش لەسەر قەڵا شانبەشانی یەکتر

سەر تا پێ جلی سوور دەپۆشن. بە خوێنی خۆیان نەخشەی شازلاند لەسەر دەموچاویان دەنەخشێنن. هەر لەسەر کۆپتەرەکە، خەڵکەکە وا دەردەکەون لە هەر دڵۆپە خوێنی شەهیدێکی مەرد مرۆڤێك دروست بووبێ و دوو قاچی گرتبێ و هاتبێتە ئەوێ. قەڵا لە سەرەوە و لە دوورەوە بە شۆڕشی خوێن دەچێ.

هەر بابایە و بەرەو قەڵا را دەکا. هەیە گەیشتووەتە دامێنی قەڵا، بەڵام هێندە قەرەباڵغە ناتوانێ وەها ئاسان بچێتە سەرەوە، ئەوانەشی کە دەگەنە سەرەوە دەسبەجێ جلیان سوور دەبێ، نەخشەی شازلاند لەسەر روویان دێتە نەخشاندن. راستەوخۆ دەبن بە بەشێك لە تۆپەڵە خوێنەکە یان دەریاکە. شوێنێك نامێنێ لەسەر قەڵا، مرۆڤێکی خوێنینی تێدا نەبێ. قەڵا سیفەتی میزەڵان وەردەگرێ، چ میزەڵانێك، هەر چەند فووی تێبکەی نەتەقێ، قەڵاش وای لێ دێ، هەر ٩ ملیار مرۆیەکەی سەر رووی زەو بچێ، لەوێ شوێنی دەبێتەوە.

## ٢

پۆلیس، بە هەموو لك و پێکهاتەکانی، سەری لەوە دەر ناچێ ئاخۆ ئەو خەڵکە لەسەر قەڵا چیان دەوێ و بۆ وا دەکەن. هێزەکانی سەپاندنی یاسا، هەر هەموو داوودەزگاییێکیان، لە چوار دەوری قەڵا کۆ دەبنەوە و قورسترین چەکیان ئاڕاستەی چیای خوێنین دەکەن. هەرچی دەنگ گەورەکەر هەیە بەکاری دەهێنن و هاوار دەکەن و دەڵێن: "تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە." هەر کەسێك یان شتێکی دەسەڵات لە قەڵا نزیك ببێتەوە، دەسبەجێ بە گەرمایی ڕەنگی سوور دەتوێتەوە. دەیانەوێ بە کۆپتەر بچن راستەوخۆ لەسەرەوە بنیشنەوە، کەچی کۆپتەر دەسبەجێ سوور دەبێ و دەتوێتەوە.

بۆیە هەر هەموویان لە دووری یەك کیلۆمەترەوە بە دەنگ گەورەکەر هاوار دەکەن: " تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە." ئەگەر لە ئاسمانەوە سەیری قەڵا بکەی، هیچ نابینی، جگە لە گڕکانێکی سوور نەبێ، گڕکانێك تژی لە مرۆی سوور و تووڕە. فرمێسك، تووڕەیی، سوێ و هەنسکی مرۆگەلی سوور دەبێتە شلەی گڕکان و هەموو شتێك دەتوێنێتەوە.

## ٣

لەسەر قەڵا تەمەن نامێنێ، هەرچی لەوێیە تەمەنی ٢٥ ساڵ دەبێ، هەر منداڵێ، پیرێ، پیرەژنێك بگاتە ئەوێ، راستەوخۆ تەمەنی دەبێتە بە ٢٥ ساڵ و سوور هەڵدەگەڕێ. غەریزە فیتڕییەکان نامێنن، کەس برسی نابێ، کەس تێنووی نابێ، کەسیش خەوی نایەت، کەس مەیلی سێکسی نامێنێت.

لە ڕۆژی ٢٢ەمی ئاپۆرەکەدا، گەورەترین کاربەدەست، وەزیرگەل، ئەندام پەرلەمان، هەرچی بەرپرس و کاربەدەست و دادوەر و حاکم و میری ئەم وڵاتە هەیە دێن لە دووری یەك کیلۆمەتر بە دەنگ گەورەکەر هاوار دەکەن: تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین چیتان دەوێ."

هەواڵی ئەم قەڵا سوورە بە هەموو دنیادا بڵاو دەبێتەوە. کۆپتەرێکی تەلەفزیۆنی "بێنازان" و کۆپتەرێکی تەلەفزیۆنی "خەیاڵ" و یەکێکیش هی "بی بی نێت" دەتوێتەوە دوای ئەوەی هەوڵ دەدەن لە ئاسمانەوە وێنەکە بگوازنەوە. هەرچی دەزگای ڕاگەیاندن هەیە لە دنیا، بە ئاژانسە زەبەلاحەکانیشەوە، لەوێ کۆ دەبنەوە و ڕاستەوخۆ قەڵای سوور لە دووری یەك کیلۆمەترەوە

دەگوازنەوە بۆ هەموو دنیا. لەسەر شاشەکانی دنیا ئەم دیاردەیە دەبێتە هەواڵێکی بە پەلە و سەردێری جۆرەوجۆر دەنووسرێ:

بە پەلە: قەڵای شاری زیندووان سوور دەبێ

بە پەلە: خەڵکی شازلاند لەسەر قەڵا کۆ دەبنەوە و رەنگی سوور دەپۆشن

بە پەلە: کەس نازانێ مرۆ سوورەکانی سەر قەڵای سوور چییان دەوێ

بە پەلە: دووی سوور داوا لە مرۆ سوورەکان دەکا قسە بکەن

بە پەلە: قەڵای سوور وەك شلەی گڕکان شت دەتوێنێتەوە

بە پەلە: سێ کۆپتەری میدیا دەتوێنەوە لەسەر قەڵای سوور

بە پەلە: پەرجۆی شازلاند پلوورەی خوێنە

## ٤

قەڵای سوور نەك هەر لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بگرە لە سەرانسەری دنیا دەنگ دەداتەوە و دەبێتە جێ سەرنجی گشت سەرۆك، سیاسەتوانان، چاڵاكوانان، بازرگانان، نووسەران، رۆژنامەنووسان، رێكخراوگەلی مرۆیی و ناحكومی.

گەورەترین كاربەدەست بە دەنگ گەورەكەرەكەی دەستی دیسان هاوار دەكاتەوە: "تكایە با نوێنەرێكتان بێ و قسە بكە تا بزانین داواكاریتان چییە. تكایە، ئەی خەڵكی بەشەرەفی شازلاند پێم بڵێن چیتان دەوێ؟ هەر چییێكتان بوێ من ئامادەم جێبەجێ بكەم."

لە ناكاو، لافیتەیەكی سووری گەورە لە قەڵاوە بەرز دەكرێتەوە. بە گەورەیی و بە رەشی لەسەری نووسراوە: "ئێمە دەمانەوێ داهێنەری دووی سوور لە زیندان ئازاد بكرێ!"

تەواوی هێزەكانی سەپاندنی یاسا، گەورە كاربەدەستان، تەنانەت گەورەترین كاربەدەستیش بێ دەنگ دەبن و ناتوانن هیچ وەڵامێكی ئەم داوایە، ئەم پەیامەی مرۆگەلی سووری سەر قەڵای

سوور بدەنەوە. ئەمە دەبێتە سەردێری تەواوی میدیای جیهان. هەموو کەس لە دنیا دەپرسێ: "دووی سوور چییە، کێیە؟"

یەکێك لەسەری سەرەوەی پەیکەری خوێن، لە هەموو لاشەی خۆی نووسیویەتی: "ئێمە هەموومان پەیکەری جووڵەین." یەکێکی تر نووسیویەتی: "پەیکەری جووڵە هەرگیز نامرێ!"

## ١

له ٢٠١٣/٠٢/٢٢دا، بارانێکی بەخوڕ دایکرد. سێ ڕۆژ لەسەر یەك، باران نەبڕایەوە. دڵۆپی باران بەقەد پشکێکی گەورەی گۆشت وابوو کە قاپێکی برنج بەجارێك دادەپۆشێ. تەنانەت بۆ یەك خولەکیش باران نەوەستا. ئەگەر بارانەکە بەڕەحمەت بێ، وەك ئەوە وایە ئەم وڵاتە هێندە چڵکنە لە پیسی و تاوان و گەندەڵی، خوا بارانێکی وەهای ناردووە تا پاکیان بکاتەوە. ئەگەر بارانەکەش غەزەب بێ، وەك ئەوە وایە ئەم وڵاتە هێندە چڵکن، پیس، تاوانبار، گەندەڵ، دوژمنی خوا و ئەخلاق، خوا لێیان تووڕە بووە و بە باران نغرۆیان دەکا. کەس نەیدەزانی بارانەکە رەحمەتە یان نیقمەت.

زۆربەی زۆری گەڕەگەکانی شاری زیندووان، مەستی و مەنگ ژێر ئاو کەوتن. گەڕەك هەبوو ئاو سێ مەتر هاتبووە ناو ژوورەکان. گەڕەك هەبوو لەبەر لافاو، هەرچی ئۆتۆمبیل، دار و بەرد هەبوو رایماڵی.

لە گەڕەکێکی شاری زیندووان، تەواوی قوتابخانەیەکی سەرەتایی بن ئاو کەوت، ٢٢٢ منداڵی چاوگەشی بێ تاوان لە ئاودا خنکان. لە گەڕەکێکی مەستی، نەخۆشخانەیەك ژێر ئاو کەوت،

هەرچی نەخۆش و دکتۆر و ستافی نەخۆشخانە هەبوو تێیدا خنکا. لە مەنگ، گەڕەکێکی نوێ بە تەواوی نغرۆ بوو، ٢٢٢٢ کەس بوونە قوربانی. ڕۆژێکی یەکجار بەدووم بوو بۆ شازلاند. وەك بڵێی ڕۆژی رووخانی شازلاند بێ. باری دەروونی خەڵك تەواو تێکچوو بوو، خەریك بوو دڵی دایباب و جەرگسووتاوان شەق ببا. لەو رەوشە ناخۆش و دۆزەخییەدا، یەك کەس نەبوو بڵێ ئەرێ بۆچی بە ئاوی باران وڵات وا نغرۆ دەبێ.

## ٢

باران بڕایەوە و وڵات بووبوو بە دەریا. ڕۆژی دواتر، کەس باسی قوربانیانی نەکرد. کەس باسی ئەو منداڵە چاوگەشانەی قوتابخانەکەی نەکرد. کەس نەیگوت کاکە نەخۆشەکان خنکان، کەس نەیگوت لە مەنگ گەڕەکێك ژێر ئاو کەوت. تەلەفزیۆنگەلی ناوخۆ و سەتەلایت، هەر هەموو شاشەکان، سەما و هەڵپەڕکێ و قوونبادان بوون. سەیری شاشەکانت دەکرد، شازلاند شامی شەریفە و دلۆپێکیش باران نەباریوە، کەسیش نەبووەتە قوربانی. دوای بارانەکە، هەر کەس چووە سەر کاری خۆی و کەس نەیپرسی ئاخۆ لەم وڵاتە زێراب هەیە یان نا. باشە ئاو بۆ نەچووە ناو زێرابەکان، بۆ ئەم لافاوە دروست بوو؟

٣

گەنجێکی باڵا مامناوەند، روو گەش، دەموچاو کرژی تووڕە. چاو قاوەیی، قژ پڕی بە سمێڵ و ریشێکی باریك. قۆڵ و باسکی بە هی پاڵەوانەکان دەچوو، بەلەکی پێی رێك وەك هی یاریزانەکانی ئاسن وا بوو. لەشێکی رێك و تۆکمەی هەبوو. دەستەکانی دەتگوت لە کەرتە شاخ دروست کراون. لە گەڕەکێکی هەژاری قەڵا، دایك و باوکی نەخوێندەوار، خۆی کۆلێژی هونەری تەواو کردووە و ئێستە بێکار. لەم لافاوەی شازلاند، لە هەر سێ شارەکەدا، ئەو زیانی گیانی پێکەوت. خوشکێکی شەشساڵانەی لە قوتابخانەکەدا بوو، خنکا. برای مامۆستای وانەی کوردی بوو لە مەنگ، لەوێ لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوو، ئەویش خنکا. مامی، تاکە مامی خۆشەویستی کە شوێنی دێبابی بۆ پڕ کردبووەوە، لە نەخۆشخانەکەی مەستی خەوێنرا بوو بە نیازی نەشتەرگەری جومگەی حەوزی چەپ، ئەویش لە کاتی ژێر ئاوکەوتنی نەخۆشخانەکە، فەوتا.

ئەم گەنجە وەك برووسکەئاسا لەو فەرمانگە حکوومییە دەچووە ئەو فەرمانگە، لەو وەزارەت بۆ ئەو وەزارەت، لەو بنکە بۆ ئەو

بنکە،لەوێ بۆ وێ دەیپرسی: "کێ بەرپرسیارە لە زێرابەکانی شازلاند؟"

دەیگوت: " پێم بڵێن بۆچی کاتێ باران دەبارێ، هەموو شتێك ژێر ئاو دەکەوێ لەم وڵاتە؟"

هێندە خێرا بوو، دەتگوت پەیکەری جووڵەیە. پەیکەرێك لە تووڕەیی، لە پرسیار، لە هەستی بەرپرسیارانە، پەیکەرێك لە قوربانی. پەیکەری جووڵە چووە بنج و بنەوانی پرسەکە، هەموو شوێنێکی کرد بۆ ئەوەی بگاتە سۆراخێك، بزانێ بۆچی زێرابەکانی شازلاند پەکیان کەوتووە.

بە هەزار ئەملاو ئەولا، خەڵك پێوەنان، پێداگرتن و سووربوون، گەیشتە لای وەزیری نەزانی ٢٢. وەزیر پۆشتە و پەرداخ، قات و ریباتێکی لەبەردا بوو بای شەش سەت و ٢٢ دۆلار. ئۆفیسەکەی بای ١٠ دەفتەر و پێنجسەت و ٢٢ دۆلار کورسی و مێز و جوانکاری تێدا بوو. رێك لە پشت سەرییەوە، تابلۆیەك هەڵواسرا بوو. تابلۆکە دوو سەری تێدا بوو بە یەکتر پێدەکەنین، لە خوار ئەوانیش لافاوێك تەواو وڵاتی نغرۆ کرد بوو.

پێڵاوی وەزیر قاوەیی بوو، کاتێ پەیکەری جووڵە سەیری پێڵاوەکانی کرد، شڵەژا. ئێستەش نەیزانی بۆچی شڵەژا و شپرزە بوو. ویستی بەردەکەی پێش بەردەمی وەزیر، کە لەسەری نووسرا بوو "وەزیری نەزانی ٢٢: بێسەوادی ٢٢ کوڕی نەزان"،

هەڵگرێت و توورِ هەڵبداتە تابلۆکە و هەپڕوون بە هەپڕوونی بکا، بەڵام ئارام بوو لە پێناو گفتوگۆکە و کردنەوەی گرێی لافاوەکە. بێ دەنگ بوو تا بزانێ بۆچی زێرابەکان لە شازلاند کار ناکەن، تا بزانێ ئیشی وەزارەتی نەزانی ٢٢ چییە، مەگەر پلاندانان نییە بۆ تەواوی شازلاند بە زێراب و ئاوەڕۆشەوە.

پەیکەری جووڵە لەسەر ئەو قەنەفەیە دانیشت کە لە لای راستی وەزیری نەزای ٢٢دا دانرا بوو. بێ ئەوەی چاوەڕێی چا، یان بەخێرهێنانی بکا، یەکسەر، بێ سێ و دوو، لە وەزیری پرسی: "هۆکاری لافاوەکە لە شازلاند چی بوو؟"

وەزیر رەنگێکی هێنا و رەنگێکی برد، دەمێك سوور دەبوو، دەمێکیش شین، هەندێ جار مۆر خۆی دەنواند، لەم دەمەدا لە حەژمەتان و لە نەزانیندا بووببوە حەربا، هەر جارە و رەنگێگ خۆی پێشان دەدا. چەند ساتێك پەڵەی سوور بەسەر روویەوە بوو وەك بڵێی لەم دەمەدا تووشی ئالۆش بووبێ.

" راستییەکەی ئەمە کارەساتێکی گەورە بوو ئێ ... ئێ ... ئێ، بەڵام ئێمە..."

لەم قسانەدا بوو زەنگی تەلەفۆنەکەی وەزیر لێیدا. پەیکەری جووڵە تەماشای سەر مێزەکەی کرد، ٢٢ تەلەفۆنی جۆرەوجۆری لێ بوو. ئەو تەلەفۆنەی لێیی دا دواهەمین جۆر و پێشکەوتووترینیان بوو.

" بەڵێ فەرموو..."

ورتە ورت. (کە پەیکەری جووڵە هیچی گوێ لێ نەبوو).

وەزیر بەوەندە قسەیەی ناو تەلەفۆنەکە سامت بوو، رەنگی تێدا نەما، ئێستە لە حەرباوە بوو بە مارمێلکەیەکی سپی وەك چۆن لە ترسانا خۆی تووند بە دیوارەوە دەنووسێنێ، بەم شێوەیە سپی هەڵگەڕا. دواتر رەنگی زەرد بوو، زۆر کز دەهاتە بەر چاو، وەك بڵێی یەکێك بێ لەو نەخۆشانەی ئەو نەخۆشخانەیەی لە مەستی ژێر ئاو کەوتووە. یەکسەر تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

ماوەیەك بێ دەنگ دۆش داما، وەك بڵێی هەواڵی مردنی کوڕێکی پێ درا بێ، وەك پێیان گووت بێ کوڕە هەشت ساڵانەکەت لە قوتابخانەکەدا ژێر ئاو کەوت، ئاوا تاسا و مەلوول بوو. وەزیر کەوتە نێو تێڕامانێکی قووڵەوە.

پەیکەری جووڵە زانی وەزیر بە تەلەفۆنە ٢٢ چرکەییەکەدا زۆر تێکچووە. بیری بۆ ئەوە چوو ئاخۆ دەبێ کام چایەچی حزبی باڵا دەست لەسەر تەندەری یەکێك لە پڕۆژە زەبەلاحەکان رەزیل و سەفیلی کرد بێ لە تەلەفۆن. بیری بۆ ئەوە چوو دەبێ داوای چی لێ کرا بێ هێندە تێکچوو بە تەلەفۆنەکە. پەیکەری جووڵە زۆر زوو تێگەیشت کە ئەم نەزانە ٢٢ە هیچ لە شتەکان نازانێ، ناتوانێ قسە بکە، هۆکاری لافاوەکەشی لا نییە. بۆیە هەستا سەر پێ و نیگایەکی سووکایەتی دا بە وەزیر و برووسکەئاسا لێیدا رۆیشت.

٤

پەیکەری جوولە گەیشتە لای وەزیری نەزانی ١٤. بە هەمان شێوە هیچی پێ نەبوو، لای ئەو نە بای دەهات و نە باران. گەیشتە لای پارێزگاری قەلا. لەبەر میوان، لەبەر تەندەرچییەکان، پارێزگار قسەیەکی پێ نەگوت سوودی لێ ببینێ. یەکێك لە رستەکانی بەم شێوەیە بوو: "لافاوەکە، دوێنێ، بەلێ تەندەرەکە دەرچوو بە ٢٢٢ ملیۆن دۆلار، بەلێ ببورە، لافاوەکە گەیشتە کن مالی ئێمە، بەلام ئێمە... بەلێ ئەم تەندەرە جارێ دەر نەچووە..."

پەیکەری جوولە تێگەیشت پارێزگار ئاگای لە هیچ نییە، بۆیە لەوێش رۆیشت. ئەم پەیکەرە، بە تەنیا رۆژێك، زۆر بەخێرایی هەرچی داوودەزگەی حکوومی هەیە کردی، بەلام هیچی دەسنەکەوت. بێزاری، توورەیی، هەناسەساردی، خەم، ماندووێتی سەرو سیمای پەیکەری جوولەیان بەجارێ شێواند بوو، خەریك بوو ببێتە پەیکەری بێ هوودەیی.

## ٥

ڕۆژی دواتر، پەیکەری جوولە چووە لای یەکێك لە هاوڕێکانی کە لە خێزانێکی دەولەمەند بوو. هاوڕێکەی خاوەن چەندان پڕۆژەی خۆی بوو لە شاری زیندووان. هەرچەندە گەنج بوو بەلام باوکی پێش ئەوەی بمرێ میراتەکەی دابەش کردبوو و ئەویش چەند سەت ملیۆنێك دۆلاری بەر کەوت بوو و خەریکی بازرگانی بوو. ئەو بازرگانە زۆر زیرەك بوو، لەگەلْ ئەوەشدا، زۆرجار بێ ئومێد دەبوو چونکە وەها ئاسان پڕۆژەکانی بۆ نەدەچووە سەر. هەر پڕۆژەیەکی دەست پێکردبا، مشەخۆرەکانی ولات وازیان لێ نەدەهێنا تا پشکێکیان بەر نەکەوتبا. کەچی هەر سەرکەوتووش بوو لە بازرگانی، هەردەم بە پەیکەری بازرگانی بانگیان دەکرد. وەك بازرگانانی تر نەبوو شەو و ڕۆژ گرێ دا تا فێلْ لە گەل و نیشتمانی بکە بۆ عانەیەك.

پەیکەری جوولە و پەیکەری بازرگانی دوو هاوڕێی کۆنی یەکتر بوون. کاتی خۆی لە کۆلێژ پێکەوە بوون. جار جار یەکتریان دەبینی و باسی ئەم دنیایەیان دەکرد.

پەیکەری جوولە لە پەیکەری بازرگانی پرسی: " ئاخۆ بۆچی لافاو بەوەندە بارانە هەڵسا، لەبەرچی زێراب و ئاوەڕۆکان کاریان نەدەکرد و ئەو هەموو کەسە بوونە قوربانی."

پەیکەری بازرگانی، دەموچاوی سوور بوو، چاوی بچووک، هێندەی خەو دەهات چاوی هەڵنەدەهات، وەك بڵێی دوێنێ شەو تا چواری بەیانی خواردبێتییەوە. جگەرەیەکی دەرهێنا و دایگیرساند. مژێکی قووڵی لێ دا، ئەوجا دەستی بە قسان کرد:

"کاکە لەبەر ئەو ئەژدیهایانە وەزعەکە هەر ئەوها دەبی. پرۆژەیەك دەرچووە بۆ چاککردنی هەموو سیستمی زێراب و ئاوەڕۆی شازلاند. پرۆژەکە بۆ ئێمە دەرچووە، ئێمەش کۆمپانیایەکی بەریتانیمان هێناوە، کە نامەی گەورەترین کاربەدەستی ئەوێی پێیە، هێندە ناوبانگ و ناسرا و جێ متمانەیە. ئەو کۆمپانیایە دەتوانێ بە ماوەی شەش مانگ تەواوی زێرابی شازلاند چاك بکا و چی تر باران خەڵك نەخنکێنێ. پرۆژەکە بای یەك ملیار دۆلارە. هەموو شتێك تەواو بوو ویستیان دەست پێ بکەن، لەپڕ نامەیەك لەلایەن گەورەترین کاربەدەستی وڵات هات. لە نامەکەدا نووسرا بوو: "تکایە نرخی پرۆژەکە بکەن بە دوو ملیار دۆلار، ملیارێك بۆ ئێوە و ملیارێکیش بۆ ئێمە، ئەگەر وا نەکەن ئەوا ناتوانن کار لەم پرۆژەیە بکەن."

"مەبەستت ئەوەیە ئەو گەورە کاربەدەستە سەرانەی دەویێ؟" پەیکەری جوولە پرسی.

" بەلێ. هەر بۆیەشە پرۆژەکان سست و خاون و تەواو نابن."

## ٦

هەردوو پەیکەر بۆ ماوەیەك لە یەكتری رامان و بیریان لەو بەزمەی دەسەڵات دەكردەوە. پەیكەری جووڵە وەڵامی خۆی وەرگرت. تێگەیشت بۆچی پڕۆژەكان ئەنجام نادرێن. تێگەیشت كەوا كەس خەمی هاوڵاتی و وڵاتی نییە. كاربەدەستان خەمی گیرفانی خۆیانە و هەردەم راوی دۆلار دەكەن تا ژمارەیەك بەخەنە سەر سەتان ملیۆن دۆلارەكانیان. گرنگ نییە قوتابخانەیەك ژێر ئاو دەكەویٚ یان نا، گرنگ نییە نەخۆشخانەیەك و گەڕەكێك دەبنە قوربانی یان نا، گرنگ وەرگرتنی سەرانەكەیە. هاوكێشەكە وای لێهاتووە:

***پڕۆژەی زوو تەواو بوو یەكسانە بە گەورە كاربەدەست + پڕبوونی گیرفان. پڕۆژەی دواكەوتوو و تەواونەكراو یەكسانە بە گەورە كاربەدەست – پڕبوونی گیرفان.***

دواتر هەردووكیان، پەیكەری جووڵە و پەیكەری بازرگانی، چایەكەی بەردەمیان تێك دا و یەكە و فڕێكیان لە چایەكە دا. دواتر پەیكەری جووڵە گوتی:

"بێگومان تۆ یاری كۆنكان دەزانی."

" زۆرباش،" پەیكەری بازرگانی وەڵامی دایەوە.

" وەرەقەیەك هەیە لە كۆنكان سیفەتی زۆر سەخیفی هەیە،" پەیكەری جوولە گوتی.

" كام وەرەقە؟"

" كیللی. سیفەتی ئەو گەورە كاربەدەستە وەك سیفەتی كیللی وایە،" پەیكەری جوولە گوتی.

" كیللی دینار یان كوپ؟" پەیكەری بازرگانی، بە پێكەنینەوە، پرسی.

"مەبەستم دووی سوورە!"

١

له ٢٠٠٠/٢/٢٢دا، له گۆڕەپانی گەورە له مەستی، ٢٢ شاشەی ٥٢ له تەنیشت یەکتر ریز کران. شاشەکان بەدەوری گۆڕەپانەکەدا بازنەیەکیان دروست کرد. بەجۆرێك دروست کراون که هەردوو رووبیان شاشه بێ. وەك شاشەی ئاسایی نین تەنێ یەك رووبیان هاوێنه بێ. ئەم جۆره شاشانەی گۆڕەپانی گەوره هەردوو رووبیان وێنه و دەنگ پێشان دەدەن. بەتایبەت دروست کراون بۆ ئەوەی هیچ کەسێك دەربازی نەبێ، بۆ ئەوەی هەموو کەس بیانبینێ. دەنگیان زۆر بەرز بوو، هەموو پێکەوه دەنگیان دەگەیشته ئەوپەڕی قولایی ئاسمان. ئەم دەنگه گەورەیه کاری کردبووه سەر تەواوی سیستمی رادیۆ و شەپۆلەکانی تری کارۆموگناتیسی له نێوان زەوی و ئاسماندا. شاشەکان بابوێر بوون.

## ٢

هەر لە هەمان ڕۆژدا، لە لای قەڵای شاری زیندوواندا، ٢٢ شاشەی ٥٢ لە تەنیشت یەکتر ریز دەکرێن. شاشەکان بەدەوری قەڵادا بازنەیەکیان دروست کرد. بەجۆرێك دروست کراون کە هەردوو ڕوویان شاشە بێ. وەك شاشەی ئاسایی نین تەنێ یەك ڕوویان هاوێنە بێ. ئەم جۆرە شاشانەی چوار دەوری قەڵا هەردوو ڕوویان وێنە و دەنگ پێشان دەدەن. بەتایبەت دروست کراون بۆ ئەوەی هیچ کەسێك دەربازی نەبێ، بۆ ئەوەی هەموو کەس بیانبینێ. دەنگیان زۆر بەرز بوو، هەموو پێکەوە دەنگیان دەگەیشتە ئەوپەڕی قوڵایی ئاسمان. ئەم دەنگە گەورە کاری کردبووە سەر تەواوی سیستمی رادیۆ و شەپۆڵەکانی تری کارۆموگناتیسی لە نێوان زەوی و ئاسماندا. شاشەکان بابوێر بوون.

## ٣

**لە هەمان رۆژدا، هەمان کات و سات، لە ناو جەرگەی بازاڕی شاری مەنگ، هەمان بەزم هەبوو. شاشەکانی هەر سێ شار راستەوخۆ وابەستەی یەك سەتەلایت بوون لە ئاسمان. دەنگ و شەپۆڵ و لەرەلەری ئەم کەناڵە، تەواوی کەناڵە رادیۆیی و تەلەفزیۆنەکانی تری وەستاند بوو. لە سەرانسەری شازلاند، لە هەموو ماڵێ، لە هەموو ئۆفیسێ، لە هەموو کونجێ، تەنیا یەك کەناڵ کاری دەکرد. کەناڵێکی رەنگاورەنگ، فووڵ ئێچ دی، ساف و روون.**

**لە شاشەکاندا، هەر سەعاتە و گەورە کاربەدەستێکی وڵات قسەی دەکرد. هەموو سەرە سەعاتێك کاربەدەستێك وتارەکەی تەواو دەبوو، یەکێکی تر دەهات. هەر یەکە و پەیامێکی پێ بوو، هەر هەموو پەیامەکانیش خزمەتی یەك پەیامی گەورەیان دەکرد ئەویش ئەمە بوو:**

***ئێمە تا ئەبەد هەر لێرە دەبین و خزمەتتان دەکەین، کەسی تر لە ئێمە باشتر نییە بۆ خزمەتکردنی ئێوە.***

کەناڵەکە سیفەتی ئالوودەبوونی هەبوو، هەر یەکێ لە ناو شار، بازاڕ ، یان لە ماڵەوە بۆ یەك چرکە تەماشای کردبا، یەکسەر دادەنیشت بەدیارییەوە. هەبوو زاوا بوو، هاتبووە سەرتاشخانە لە بازاڕ تا خۆی بڕازێنێتەوە بۆ زەماوەند، بەڕێکەوت بۆ ماوەی یەك چرکە چاوی بە شاشەیەك لە شاشەکان کەوت، کەچی زەماوەند و بووك و سەرتاشخانەی بیر چووەوە، چوار مەشقی بەرامبەر شاشەکان دۆش دادەما.

٤

دایکێك بەپەلە کوڕە تاقانەکەی هێنایە نۆرینگەی پزیشك لە شەقامی پزیشکانی شاری زیندووان. ئەویش بەڕێکەوت بۆ ماوەی یەك چرکە لەلای پەیکەرەکەی دووی سوور، لەبەردەم وێنەگری ئۆتیزم، سەری هەڵبڕی و چاوی بە یەکێك لە شاشەکان کەوت لەلای قەڵا. ئیتر ئاگای لە کوڕە تاقانەکەی نەما. وردە وردە بەرەو شاشەکان چوو. بە دەنگە گەورەکەی شاشەگەل، کوڕە تاقانە نەخۆشەکە، باری خراپتر بوو، هێندەی پێ نەچوو بوورایەوە. دایك ئالوودەی شاشەیل، وایدەزانی کوڕە تاقانەکەی لە ژیانیدا نەخۆش نەکەوتووە و حاڵی زۆر باشە. تەنانەت بۆ جارێکیش، نیگایەکی یەك چرکەیشی نەدا بە کوڕە تاقانە نەخۆشەکەی.

بەم شێوەیە، هەرچی دەهاتە ناو بازاڕی مەستی، بەتایبەتی گۆڕەپانی گەورە، شاری زیندووان، بەتایبەتی لای قەڵا، مەنگ، بەتایبەتی ناو جەرگەی بازاڕ، رێك چوار مەشقی دادەنیشت و بەرامبەر شاشەگەل شێت و شەیدا، وەك بڵێی بۆ یەکەم جار بێ کچەکەی کافرۆش بەڕاستی و بەڕووتی ببینن ئاوا چاویان ئەبڵەق دەبوو، تەنانەت بۆ یەك چرکەش چاویان هەڵنەدەگرت. جاری وا

هەبوو، شوێن نەدەما، هەمووی ریزی دەبەست، یەك بەدوای یەك، وەك بڵێی رۆژی هەینییە و وتار دەخوێنرێتەوە. وەك ئەوە وابوو مەلاگەل لەسەر شاشەكان بن و باسی ئەفلامی رووتەمەنی بكەن، یاخود كچەكەی كافرۆش بەڕووتی نمایشی خۆی بكا بۆ یەكەم جار لە شازلاند. مزگەوتەكان چۆڵ بووبوون، چونكە لەبەر ئالوودەیی شاشەگەل، كەس نەدەچووە نوێژی هەینی.

## ٦

لەسەر شاشە، یەکێك لە گەورە کاربەدەستەکان، وەزیری نەزانی ٥ بوو. ورگی تا بەردەمی بوو. سەری خڕ خڕ وەك کەلا بەرد کە کاتی خۆی وەك دەسکەلا منداڵان بەکاریان دێنا لە یاری کەلایانیٚ. برۆی رەش و ئەستوور. چاوەکانی زەق زەق، سمێڵێکی گەورەی رەشکراو بە بۆیە، تا ناوەڕاستی سەری تاڵە مووێکی پێوە نەما بوو، هەندیٚ موو لەلا تەنیشتەکانی و لە ناوەڕاستی سەر تا پشتە ملی هەبوو. قات و بۆینباخەکەی بای هەشتسەت دۆلار بوو، شیك و رێك و راقی. بۆ ماوەی یەك سەعات وتارێکی پێشکەش کرد. باسی خۆشگوزەرانی دەکرد. کوردییەکەی دووکەڵی دەکرد وەك چۆن ئۆتۆمبیلێك سەرف بکا و بەنزینەکەشی جۆری بێجی بیٚ. ئەمەی خوارەوە کورتەی وتارەکەیەتی، دەسکاری زمانەکەی ناکەم و کاری نووسیاری بۆ ناکەم، بگرە کورتەیەکی وەك خۆی دەنووسمەوە:

***"سوپاس بۆ خوا لە سایەی سەری سەروەرمان، گەورەمان، حالی حازر کوردەستان بە خۆشی و کامەرانیدا دەچی. گەورەمان خۆش بی، ئەمە هیچ عەیبمان نییە. هەموومان لە ماڵ رۆژانە سیٚ جەمە***

***نان و گۆشت دەخۆین. کاکە جاران هەموو خۆمان لە شاخ نابوو، بە دوو مانگ جارەك، نەماندەتانی خۆمان بشۆین، ئێستە هەموو رۆژ خۆمان دەشۆین و باشترین بۆن لەخۆمان دەدەین. کاکە جاران نان نەبوو لە شاخ بخۆین، ئێستە هەموو رۆژ گۆشت و برنج دەخۆین. کاکە جاران لە شاخ بە دە کەس یەك کەرمان هەبوو، ئەوسەر و ئەمسەرمان پێ دەکردن، ئێستە، لە سایەی گەورەمان، هەر یەك لەمە هەر هیچی نەبی دوو باشترین سەیارەی هەیە."***

٧

دوای نەزانی ژمارە ٥، ئەوجارە نەزانی ژمارە ٦ هاتە سەر شاشە. قات و بۆنیباخێکی راقی، سەری رەش کرد بووەوە، لە نێوان دەم و لووتیدا، یەك خەت سمێڵ هەبوو، ورگی تا بەردەمی، کورت، چاوی قوڵ، روومەتی قوڵتی بچووك بچووکی تێدا بوو، کوونە لووتی فش فش، چاوەکانی سوور سوور، وەك بڵێی تازە لە مەیخانە گەڕابێتەوە ماڵ و یەکسەر فەرمانی پێ کرا بێ بێتە سەر شاشە. پێی گوتراوە ئێستە نۆرەی ئەوە قسە بکا. وەك بڵێی بە سوغرە رەوانەی سەر شاشە کرا بێ. ئەوەش کورتەی وتارەکەی ئەوە:

"شازلاند زۆر خۆشە. هیچ موشکیلەمان نییە لە سایەی گەورەمان، هەمووومان خۆش دەژین. ئینشالڵا تا هەتایەش هەروا دەبین، گەورەمان خۆش بی، گەورەمان سەربەرز و پارێزراو بی، ئینشالڵا هەر وا دەبین. بژی گەورەمان، بژی گەورەمان. پێم بڵێن ئێوەی گلەیی لە چی دەکەن، تەماشای دەوروپشتتان بکەن، بزانە شەقامەکان هەمووی قیرتاوە، تەماشاکەن بەم درەنگە ئێوە لەسەر شەقام دانیشتوون و کەس ناڵێ ماڵتان لە کوێیە."

ئیتر بەم شێوەیە لە هەر ٢٤ سەعاتی شەو و ڕۆژدا، هەر حەفت ڕۆژی هەفتەدا، یەك لەدوای یەك، کاربەدەستانی وڵات وتاریان پێشکەش دەکرد. وتاری بێسەروبەر، بێ مانا و بێتام. هەبوو خۆیشی بێزار بوو بوو، دەهاتە سەر شاشە تەنیا قسەی هەلەق و بەلەقی دەکرد. هەبوو دەهات تەنیا چەند ورتەیەکی لێوە دەهات و دەڕۆیشت، کەسیش تێینەدەگەیشت. کاربەدەستانیش بێزار بووبوون، بەڵام کارەکەیان هەر دەکرد، جا بە هەر شێوەیەك بووبا. کاربەدەستی وا هەبوو، خەڵك وتارەکەیان لەبەر کرد بوو. هەرکە دەهاتە سەر شاشە، خەڵکی یەك بەیەك وشەکانیان دەگوتەوە پێش ئەوەی ئەو دەریانبڕێ. ئەو زمانەی کاربەدەستان قسەیان پێ دەکرد زۆر لاواز، تژی لە هەڵە، بێسەروبەر، بێ ڕەوانبێژی، ڕێزمانی ناڕاست، دەستەواژە و ڕستەی بەرەواژی، دەتگوت هیچیان هی ئەو وڵاتە نین. دەتگوت زمانی دایکیان رووسییە، تازە فێری زمانی خۆیان بوونە.

## ٨

پەیکەری جوولّە، تەواو بێزار بوو لە بەزمی شاشەکان، رۆژێك لە لای قەلآ، دانیشت بوو بەدیار یەکێك لە وتارەکانی یەکێ لە کاربەدەستانی ولآت. کاربەدەستەکە باسی باشی خزمەتگوزاری دەکرد لە سایەی گەورەی ولآتدا. پەیکەری جوولّە گومانی هەبوو لە قسەکانی. بۆیە لەبەردەم خۆیەوە گوتی "بەخوا راست ناکەی!"

لەبەرئەوەی ئەو سیستمەی شاشەکانی هەر سێ شارەکەی بەیەکتر دەبەستایەوە، سیفەتی خوێندنەوەی گومانی هەبوو لە هەر گوێگر و بینەرێك لە هەر شوێنێك با. کاتێ پەیکەری جوولّە گومانی هەبوو لە قسەکانی، یەکسەر وتارەکان هاتە وەستاندن و گەڕان و پشکنین بەدوای گومانلێکراودا دەستی پێ کرد. لەبەرئەوەی پەیکەری جوولّە زۆر زۆر خێرا بوو، لەوێ ون بوو. دەربازی بوو لە دەست سیستمی ئەمنیی ناو شار. پاش ماوەیەك گەڕان و سوڕان، چەندان کەسیان دەسگیر کرد بەتۆمەتی گومانکردن لە وتارەکە، ئەوجار دۆخەکە هێور بووەوە و وتارەکە دەستی پێکردەوە. بینەر، چاوی ئەبلّەق، وەك بلّێی بۆ بینینی جوولّەی هەڕەمەکانی میسر دانیشتبێ، بەرامبەر شاشەگەل دانیشتەوە.

پەیکەری جووڵە گەڕایەوە ماڵ. لەوێ هیچ شاشەیەك نەبوو، تەلەفزیۆنەکەی ماڵی خۆیانی لە نێو خاولییێکی گەورەدا پێچابووەوە و لە کونجێکی ماڵەکەیدا خستبوویە ژێر مێزێکی گەورەی بێ کەڵك. شەو تا بەیانی بیری لەم بەزمە کردەوە. بەیانی لەگەڵ بانگی مەلا، چووە سەر فەیسبووك، ئەم پەیامەی خوارەوەی بڵاو کردەوە:

***" شاشەکانی شازلاند پەیکەرێکیان دروست کردووە لە درۆ. هەموو پێکەوە قێزەوەنترین پەیکەری درۆیان دروست کردووە لە جیهاندا. هاوشار و هاوڵاتییانم، ئەوەی دەبیستن درۆیە، ئەوەی دەیبینن لەو شاشانەدا درۆیە، تەواوی سیستمەکە بە درۆ بەڕێوە دەچێ. تکایە دوورکەونەوە لە پەیکەری درۆ، وەرنەوە سەر خۆ. دووبارەی دەکەمەوە، ئێوە ڕۆژانە تەنیا سەیری پەیکەری درۆ دەکەن: پەیکەرێکی ناشرینی کاژێرِ قۆپاو."***

## ٩

ڕۆژی دواتر دیدی خۆی بۆ درۆ لەسەر فەیسبووك دووپات کردەوە:

***"درۆ لە شازلاند شوێنی ڕاستی گرتووەتەوە. کاربەدەستانی ئەم وڵاتە درۆتان لەگەڵ دەکەن تا بتانخەڵەتێنن، چاوتانیان کوێر کردووە بە درۆ. دەزگاگەلی میدیا، بەهەموو ڕۆژنامە، تیڤی، گۆوار و ئۆنلاینێکەوە، درۆ ئاو دەدەن. تۆوی درۆ لە هەموو کونجێکی شازلاند چێنراوە و وا گەشە دەکەن. لك و پۆپی دارگەلی درۆی شاخدار خەریکە چاومان دەردەهێنن، گوێچکەمان سڕ دەکەن و زەینمان کوێر دەکەن."***

چەند ڕۆژێك بەسەر پەیامەکەی لەسەر فەیسبوودا تێپەڕی. بینەری شاشەیلی ناو شار، وردە وردە ڕووی لە کەمی دەکرد. داودەزگەی دەسەڵات درکیان بەمە کرد و دەستیان کرد بەگەڕان بەدوای ئەو کەسەی ئەو پەیامەی وەشاندووە لەسەر فەیسبووك و بووەتە هۆی دابڕاندنی بینەر لە شاشەیل. بەپەلە بەیاننامەیەکیان دەرکرد، ئەمەش دەقی بەیاننامەکەیە:

*"هاوڵاتییانی بەشەڕەفی شازلاند، لە هەر کوێیەك بن، سڵاوی گەرمی شۆڕشگێڕانە و نەبەردانەتان لێ بێ. ئێمە وەك بەشێك لە دڵسۆزییەکانمان بۆ ئێوەی خۆشەویست، لە هەڵمەتێکدا هەستاوین بە دەسگیرکردنی ئەو کەسەی کە پەیامێکی درۆیینەی بێ بنەمای لەسەر ئینتەرنێت بڵاو کردووەتەوە. تکاتان لێ دەکەین، هەر زانیارییێکتان هەیە، یان شکتان لە هەر یەکێك هەیە، تکایە سەردانی ئەم ناونیشانە بکەن. تکایە هاوکارمان بن لە گێڕانەوەی دۆخەکە بۆ باری پێشووی خۆی. وەك دەزانن ئێمە شەو و ڕۆژ گریێ دەدەین بۆ پاراستنی ئێوە، ئێمە هەموو شتێکمان بۆ ئێوە کردووە و دەیکەین. بەپێی زانیارییەکانمان، ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە "٢ی سوور"ی داهێناوە و هەڵیبەستووە. تکاتان لێ دەکەین هاوکاریمان بکەن لە دەسگیرکردنی داهێنەری "٢ی سوور" کە بەتەواوی بووەتە هۆی شێواندنی باری ئەمنی."*

## ١

له ٢/٢٢/ ١٩٨٧دا، له نوای کەرتە شاخێکدا، له یەکێ له شاخە جوان و سەوزەکانی شازلاندا، سێ نەبەرد، سێ پاڵەوان، سێ رزگارکەری شازلاند له ژێر دەستی دکتاتۆر و خوێنمژی دێرینی گەل، سێ جەرگسۆزی وڵات چەکەکانیان ئاڕاستەی دوژمن و چەلاوخۆرانی دکتاتۆر کرد بوو. یەکێکیان شەرواڵێکی رەش، کراسێکی سپی، لەچکێکی سوور بە ملییەوە، ریشی تا سەر سنگ جوان و سەنگین، چاوەکانی بازئاسا نیشانەی له دوژمن دەگرت. دووەمیان جلێکی شازلاندانەی مەیلە و زەردی لەبەردا بوو، تۆپە ریشێکی تژی له بوێری و خەم، جامانەیەکی سپی بەسەرییەوە، له برساندا هەناوی بەپشتییەوە نووسا بوو، دەتگوت ٢٢ رۆژە نانی نەخواردووە. سێیەمیان کراسێکی سەوز، شەرواڵ و شاڵێکی رەش بەسەر شانییەوە. هەموو گیانی تۆز بوو، له دوورەوە بە پەیکەری تۆز دەچوو. ئەو رۆژە له بەیانییەوە تا کاتی عەسر بەرگەی تۆپ و تەیارەی دوژمنیان گرت، نەبەرد و دلێرانە جەنگان. هەرسێکیان بەخۆیان و تفەنگەکانییەوە له پەیکەری شەڕ یان شەرەفی وڵات دەچوون.

دوای تۆمارکردنی داستانێکی تری تژی له شانازی و سەرکەوتن و دەسکەوت، هەرسێ پاڵەوانەکە گەڕانەوە لانەی شێرانەی خۆیان. دوای خواردنی نان و پیازێك لەگەڵ فڕکردنی جامە ماستاوی خەستی ماستی مەڕ، هەرسێکیان پاڵیان بە گاشە کەڤرەکانی شاخ دادا و کەوتنە بیرکردنەوە: بیرکردنەوەیەکی قووڵ لە پاشەڕۆژ و ئایندەی شازلاند.

## ٢

جامانه سپییەکە ناسراو بوو بە شاخبڕ، هێندە ئازا و بەجەرگ بوو. داستانی وا هەبوو، شاخبڕ سیٚ شاخی دەبڕی و راوی دوژمنی دەنا. شاخبڕ ئاوی پەیدا دەکرد بۆ هەڤالانی ئەگەر ٢٠ هەزار مەتریش لە ژێر شاخ بووایە. بیٚ ئەو، هەموو دەمردن لە تێنووان. چەندان جار بەتاقی تەنیا، شاخی بڕیوە و دزەی کردووەتە ناو رەبایەی دوژمن و نارنجۆکێکی تێدەگرتن و دەگەڕایەوە. چەندان لووتکە شاخی گرتووە. هەر لووتکەیەکیش بکەوتایەتە دەست دوژمن، ئەوا بۆ شاخبڕیان جێدەهێشت و دوای ماوەیەکی کەم دەیگرتەوە.

جلە مەیلە و زەردەکە ناسراو بوو بە کاسپەر. سیفەتی کاسپەری هەبوو، چونکە لە کاتی شەڕدا بە کەلێنە شاخی وادا دەردەچوو، مەگەر تەنیٚ بە کاسپەر بکریٚ. لە هەموو شوێنێك ئامادە بوو، بەتایبەتی لە کاتی پێکداداندا لەگەلٚ دوژمن. سەتان هەڤالی خۆی لە چنگی مەرگ رزگار کردووە. هەڤالی وا هەبوو لە ژێر لوولەی تفەنگی دوژمندا بووە، ئەو بەدیار کەوتووە و لە دوورەوە دوژمنی کوشتووە و هەڤالەکەی رزگار کردووە. کاسپەرئاسا نان و خەو و پشووی نەدەناسی.

کراس سەوزەکە ناسراو بوو بە کاك روکن. لە کاتی نانخواردندا هەر لە روکنێك دادەنیشت و وەستایانە نانەکەی حەپەلوش دەکرد. لەکاتی خەوتندا، دەچوو لە سووچێك پێخەفەکەی چا دەکرد و دەنووست. لە کۆبوونەوەکاندا، روکنێکی دەگرت و گوێی رادەدێرا. لە کاتی رۆیشتندا، روکنا و روکن دەڕۆیشت و کەس نەیدەگەیشتێ. لە کاتی شەڕدا، سەنگەری ئەو هەردەم لە روکنێکدا بوو. تا بڵێی زیرەك، چالاك و لێزان بوو لە پلانی دارایی و پلانی شەڕ.

## ٣

دوای بیرکردنەوە قووڵەکە، شاخبڕ رووی لە کاسپەر و کاك روکن کرد و پێی گوتن

"ئەرێ بەڕاست، ئێوە خۆتان چۆن دەبینن لە ئایندەدا؟"

هەردووك، کاسپەر و کاك روکن، نیگایەکی یەکتریان کرد و پرسیان، "مەبەستت چییە لە ئایندە،" پاشان دەستیان کرد بە پێکەنین و گوتیان "مەگەر ئایندەی ئێمە هەر شەڕ نییە؟"

شاخبڕ، تفەنگەکەی، کە بە شاخەکەدا دادا بوو، هێنایە سەر کۆشی خۆی و بەهەردوو دەستی ئەوسەر و ئەوسەری گرت، ئەوجا گوتی: "نا کوڕینە، مەبەستم ئەوەیە دوای ئەوەی وڵات رزگار دەکەین، ئێوە بەنیازی چین، واز دێنن و دادەنیشن، یان هەر خەریکی خزمەتکردن دەبن؟"

کاسپەر، دەستی لە کونەلووتی دەرهێنا، قورگی ساف کرد و گوتی، "مەبەستت چییە لە خزمەتکردن؟"

"مەبەستی ئەوەیە ئاخۆ دەمانەوێ لە بەرەکەی بخۆین، یانیش دانیشین و رێ بۆ ئاقڵ و بیرمەندانی وڵات چۆڵ بکەین تا بتوانن

ولاتێکی رێك و جوان و مۆدێرن دروست بکەن،" کاك روکن، دوای ئەوەی دەستێکی بەڕیشی داهێنا و خەنییەوە و وای گوت.

"ئەها، ئیٚ ئیٚ ئیٚ،" کاسپەر سەرێکی بادا و دوور تێڕاما.

کاك روکن، کە لەم دانیشتنەش روکنی گرت بوو، گوتی، "ناوەڵا، من هەمان پرسیار لە خۆت دەکەم کاك شاخبڕ،" کەمێك جێی خۆش کرد و بەردەوام بوو، "تۆ چی دەکەی دوای رزگاربوون؟"

"ئەی بۆ خۆت ناڵێی کاك روکن؟" کاسپەر هەڵیدایە و پرسیارەکەی ئاڕاستەی ئەو کردەوە.

## ٤

دوای چەندجارە کردنەوەی پرسیارەکە لە یەکتری، هەرسێکیان پەتۆیەکی قووڵیان هەڵمژی و ماوەیەك بەرامبەر سروشت دۆش دامان. هەر یەکە بیری لای ماڵ و منداڵەکەی بوو. بیر و خەیاڵ گەیشتە ساڵی ١٩٩١ و ئەودیو راپەڕین. خەیاڵ بڵقی دا کەوا هەرسێکیان پەیکەری خۆیان لەسەر شەقامەکانی شازلاند دەبینن، بەڕێز و سەنگین و دڵسۆز سەیر دەکرێن. خەیاڵ فڕی کەوا هەرسێکیان بەدوای پارە و پوول و پۆستدا نەچن، بگرە هەر خزمەت بکەن لە بواری سەربازی تا ئەو دەمەی گەنجەکان پێ دەگەن و دواتریش دانیشن.

" پەیکەرێك لە پارە دروست دەکەم،" شاخبڕ پەیکەری خەیاڵ و دڵسۆزی شکاند و لە پڕ وای گوت.

" من پەیکەرێك لە موڵك دروست دەکەم،" کاك روکن ئەمەی خستە سەر قسەکانی شاخبڕ.

"منیش پەیکەرێك بە ڤێلا دروست دەکەم،" کاسپەر کەمێك خۆی رەپێش کرد و وای گوت.

دواتر هەرسێکیان بە خەیاڵی ئەم قسانەوە، کەمێك پاڵکەوتن.

## ٥

نۆ پایز بەسەر ١٩٨٧/٢/٢٢دا تێپەڕی. داستانە مەزنەکان بەریان گرت. ئەو شەڕ و قارەمانایەتییانەی شاخبڕ، کاسپەر و کاك روکن کردیان لە شاخ وەك گەنم پێگەییو و بەرهەمەکە لەلایەن ئەوان و هاوشێوەی ئەوان دوورایەوە. سەردەمی شەڕ، تفەنگ، شاخ و تۆز بەسەرچوو. سەردەمی مەنسەب و ئۆتۆمبیل، باڵەخانە، قات و ریبات، پێڵاوی ئیتاڵی، ڤێلا، پەیکەری پارە، مێزی دیالۆگ و پەرلەمان و حکوومەت بوو. بەکورتی سەردەمی شاخ گۆڕا بە سەردەمی شار، هی تفەنگ بوو بە قەلەم، شەڕ بوو بە گەڕ.

پەیکەری جووڵە کتێبێکی لەسەر دیرۆك و خەباتی شازلاند خوێندەوە. لە دواهەمین شەودا، کە ١٢٢ لاپەڕەیەکی کتێبەکەی مابوو، تا نیوەشەو بەدیارییەوە دانیشت و تەواوی کرد. کتێبەکە بە وردی و درێژی باسی داستانەکانی تێدا بوو. باسی قارەمانێتیی شاخبڕ، کاسپەر و کاك روکنیشی تێدا بوو. دوای ئەوەی تەواوی کرد، هەر لەسەر مێزەکەی کە لە سوچێکی ژووره بچووکەکەی بوو، کەمێك بۆرژا. ژوورەکە پەنجەرەیەکی بچووکی یەك بەیەکی هەبوو، دۆلابێکی بچووك، چەند تابلۆیەکی بچووك. ژوورەکە بێ تەلەفزیۆن

بوو. ئەو شەوە دوای تەواوکردنی کتێبەکە، نەچووە سەر کەروێتەکەی بۆ نووستن، بگرە هەر لە شوێنی خۆی لەسەر کورسییە دارینەکەی، رووی لە مێزەکە و سەری بە قۆڵەکانی کرد. پاش کەمێك بۆرژان، خەو بردییەوە. هێندەی نەبرد هاوارێکی کرد و راپەڕی. هەموو گیانی ئارەق بوو، هیلاك و شەکەت.

## ٦

کاتێك رۆژی کردەوە بەپەلە چووە لای پەیکەری نووسین و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەمەی خوارەوە کورتەکەیەتی:

***"هەریەك لە شاخبڕ، کاسپەر و کاك روکن، لە حکوومەت پۆستیان وەرگرت. شاخبڕ کرا بە بەرپرسی سەربازی، کاسپەر بەرپرسی پاراستن و ئاسایشی وڵات و کاك روکنیش بەرپرسی داراییی وڵات. لە ماوەی تەنانەت یەك ساڵ، نا ساڵێکیش تەواو نەسوڕاوە، خەونی راستەقینەی خۆیانیان هێنا دی: شاخبڕ پەیکەرێکی لە پارە دروست کرد، کاسپەر پەیکەرێك لە ڤێلا. لە زەوییێکدا ٢٢٢ ڤێلای دروست کرد، هەر هەمووی کرد بەناوی خۆیەوە، لە ئاسمانەوە ڤێلاکان بە پەیکەری ڤێلاکان دەچوون. کاك روکنیش بوو بە خاوەنی پەیکەری موڵك، چونکە هەرچی روکن هەبوو لەم وڵاتە بەناوی خۆیەوە کرد."***

٧

پەیکەری نووسین داوای لە پەیکەری جووڵە کرد بچنە دەرەوە و چاییێك بخۆنەوە. بەدەم ڕێوە پەیکەری نووسین پرسی: "باشە بۆ هێندە بەم خەونە تێکچووی. هەست دەکەم زۆر کاری تێکردی."

پەیکەری جووڵە جانتاکەی لە شانی چەپی گواستەوە بۆ شانی ڕاستی و دەستێکی بە جانتاکەوە و دەستەکەی تریشی لە نێو گیرفانی دانا، ئەوجا هێمنانە گوتی:

" ئەو ماوەیەی بووری کتێبێکم خوێندەوە کە بەوپەڕی ئازایەتی و دڵسۆزی و مەردایەتی باسی لەو سێ کەڵە پیاوە دەکرد. باشە تۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێ و هەریەکە و پەیکەرێکی دروست کرد بێ."

"بۆ نا، ڕێی تێ دەچێ، چونکە ئێستە هەرسێکیان پۆستی گەورە و هەستیارییان هەیە،" پەیکەری نووسین دوای هەناسەیەکی سارد وای گوت.

"ئەگەر هەر یەکێ شتێ لەبارەی مەزنی و پیاوەتی و شکۆمەندیی ئەوان بخوێنێتەوە، هەرگیز باوەڕ بەم خەونەی من ناکات،" پەیکەری جووڵە، کە هەردەم هەنگاوێك و دووان لە پێش پەیکەری نووسین بوو لە ڕۆیشتن، گوتی.

پەیکەری نووسین، هەربەدەم رێوە جگەرەیەکی داگیرساند، دوای یەکەم مژ رووی لە ئاسمان کرد و دووکەڵەکەی بەڕەڵا کرد، پاشان گوتی، "کاکە ئەگەر خەونەکەی تۆ راست بێ، ئەوا بێ شک خەتای دووی سوورە."

## ٨

هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین. تا ماوەیەك بێ دەنگ بوون. پاشان سەیرێکی یەکتریان کرد. هەردووك دووی سووریان دووبارە کردەوە و دیسان پێکەنین. ئیتر تا گەیشتنە چایخانە باس باسی دووی سوور بوو. چایخانەکە زۆر بچووك بوو، لە کونجێکی ناو جەرگەی بازاڕدا بوو. هێندە بچووك بوو هەر بەشی هەشت نەفەری دەکرد لێی دانیشن و بەپەلە چایەك بخۆنەوە. بەڵام ئەم چایخانەیە شوێن و پەناگەی پەیکەرەکان بوو، دەهاتن لەوێ تاوتوێی زۆر شتیان دەکرد. هەندێ جار لە ناوەخۆیاندا دەیانگوت:

"باشە ئەوە کەی چایخانەیە، باوەڕ بکە سەی تەنگاو بکەی رووی تێ ناکات."

هەردوو پەیکەر چوونە ژوورەوە. لە شوێنێك دانیشتن. لە پێشەوە سەماوەر و شەکردان و پیاڵە لەسەر دیوارێکی کاشیکراو دانرا بوون. عادەتەن چایچی لەوێ رادەوەستا و چای بۆ موشتەرییەکان تێدەکرد. ژوورەوەش بەدرێژایی پیتی ئێڵ ریزێك کورسی درێژی پێکوەنووساوی ئاسنین هەبوو، لەگەڵ چەند تەپڵەیەکی بچووك، ئەوانیش ئاسن بوون. بەدەم چایخواردنەوە

پەیکەری نووسین گوتی "دەزانی ئێستە زۆر کەس دەزانن دووی سوور کێیە."

"تۆ بلێی رۆژێك بێ هەموو ولات لەوە تێبگەن و بزانن بە کێ دەگوترێ دووی سوور، بزانن سیفەتگەلی دووی سوور چییە؟"

# ١

له ٢/٢٢ی ٢٠٠٩دا، له ماڵ بەرەو کۆبوونەوەیەکی فراوان له دەڤەری بەرزایی سپی له شاری زیندووان کەوتە ڕێ. برۆ ڕەش، پان و ئەستوورەکەی دوو سانتیمەتر لەسەر چاویلکە ڕەشەکەی لە دوورەوە دەبینرا. قاتێکی ڕەشی خەت خەتی ئاچووغ، بۆینباغێکی شینی خەت خەت باریکی سپی، پیاوە بەژن مامناوەندییەکەیان لە کۆمەڵێك پیاوی قات لەبەر و چاویلکە لەچاو جیا دەکردەوە. هەر قات و ڕیباتەکە نەبوو، ئەو پیاوەیان وەها جیا پێشان دەدا، بگرە سەعاتی دەستی کە بای چار دەفتەر دۆلار بوو، پێڵاوە ئیتاڵییە گرانبەهاکەی، هێما ئەڵماسییەکەی سەر سینگی لەلای ڕاست، بۆنە دانسقە و گرانبەهاکەشی، کە لە دوورەوە هەموانی مەست دەکرد، ئەوانەش هەموویان ئەو پیاوەیان لەوانی تر جیا دەکردەوە.

٢٢٢ کەس لە پشتییەوە دەڕۆیشت. هەر ٢٢٢ چوارشانە، باش ڕاهێنراو، چاو تیژ و قووڵ، قات ڕەشی بەژن بڵند بوون. هەر ٢٢٢ یەك ئاست دەڕۆیشتن، یەك جووڵە و یەك جۆرە پێڵاو و یەك جۆرە چاویلکەیان لەچاو بوو. تێر گۆشت و تێر نان دەهاتنە بەرچاو. پڕ، بەتاقەت و بەزەبر بوون. هەر ٢٢٢ پاسەوانە تایبەتەکە ئامێرێکیان

بەلا سمتەوە بوو و وایەرێکی سپیش لە گوێچکەی راستیان بەسترا بوو. لە دوورەوە هێندە رێك و پۆشتە و پەرداخ و زیت دەردەکەوتن، دەتگوت پەیکەری مۆدەن.

پیاوە سەعات لەدەستە چوار دەفتەر باوییەکە سەرۆکی دەستەی گومانکردنی شازلاند بوو. مرۆییێك تژی لە گومان. گومانی لە نزیکترین کەس و هاوڕێکانی هەبوو، تەنانەت دایباب، خوشك و براکانیشی. لەبەرئەوەی بەرزترین ئاستی گومانی هەبوو لە دڵیدا، هەڵبژێردرا بە سەرۆکی دەستەکە، گوایە ئەمە باشترین کەسە بۆ پاراستنی شازلاند.

## ٢

هەندێ جار شەوانە بە ٢٢ زنجیر دەیانبەستاوە چونکە گومانی لە ئەندامانی لەشی خۆی دەکرد، بۆیە بەدڕندانەترین شێوە ئازاری خۆی دەدا. لە ساتی گومانکردن لە خۆی، ئەگەر وازی لێ بێنی بە قەپاڵتان وەردەگەڕێتە گیانی خۆی و خۆی دەخوا. وەك بڵێی لە ناو سکی دایکی، تۆوی گومان لە دڵ و هەناویدا چێنرابێ، لەگەڵ گەورەبوونی خۆی، دار گومانەکەش گەشە کرد بێ. درەختی گومان لە ناخیدا لك و پۆپی دەرکردبوو. لکەکانی ئاسایی نەبوون. لکێکی رك بوو، لکێکی ئازاردانی خەڵکی بوو، لکێکی گەندەڵی بوو، لکێکی گومان بوو دژی شازلاند، لکێکی وێرانکردنی شازلاند، لکێکی گرتنی خەڵك بوو، لکێکی کوشتن بوو، لکێکیشی هەڵبەستانی کەیسی تیرۆر بوو بۆ ئەو کەسانەی لەخۆیان هەڵدەگەڕانەوە.

کاتێ گەیشتنە هۆڵی کۆبوونەوەکان لە بانەیلی سپی، هێشتا ئۆتۆمبیلە گرانبەهاکەی نەوەستا بوو، پاسەوانگەل لە ناو ئۆتۆمبیلەکانیان فڕین و هەر چوار دەوریان گرت، بیست کەس خۆی بە دەرگە دادا تا لەگەڵ وەستانی ئۆتۆمبیل دەرگەکە بکەنەوە.

پەیکەری گومان هاتە خوارەوە و بروسکەئاسا رای کردە هۆڵی کۆبوونەوە. ئەوانەی لە هۆڵەکەدا بوون بۆ پێشوازی، بە گەنج و پیرەوە، بە ئافرەت و پیاوەوە، دەست لەسەر سینگ، خۆیان چەماندەوە و پێشوازییان لێ دەکرد و دەیانگوت: "بەخێرهاتی گەورە و سەروەرمان." ئەمانەی خوارەوە چەند رستەیەك بوون لە دەمی پێشوازیکەرەکان دەردەپەڕین:

***"لە شازلاند هەر تەنیا تۆ مرۆی، تۆ پیاوی، ئەوانی تر هەمووی دڕندە و گورگ و پشیلەن."***

***"جەنابت نەبی، ئێمە هەموومان دێینە خەساندن."***

***"تۆ نەبی، ئێمە هیچ نین."***

## ٣

سەرۆکی دەستەی گومان لە شازلاند ناسراوە بە پەیکەری گومان، هەندێ جاریش پێی دەگوترێ پەیکەری بزرکردن چونکە زۆر کارزانە لە بزرکردنی هەر شتێك بیەوێ، جا هەر کاتێك حەزی لێ بێ یان ئەلهای نەبێ.

پەیکەری گومان لەسەر کورسییە دارین و زێڕینەکەی دانیشت.

"ئێوارەتان باش،" قورگی ساف کرد و سڵاوی کرد.

هەموو ئەوانەی لە هۆڵەکەدا بوون هەستان سەر پێ و خۆیان دانەواند، سڵاویان وەرگرتەوە. بەتەنیا سڵاوێکی سەرلێوانەی پەیکەری گومان هەر هەموویان شاگەشکە بووبوون لە خۆشیان، روویان گەش بووەوە، وەك بڵێی تام لە خۆشترین ساتی ژیانیان بکەن ئاوا کەیفخۆش بوون بە لموزە سڵاوێکی پەیکەری گومان.

هەرچی کەناڵی میدیا و راگەیاندن هەبوو لە سووچێکی هۆڵەکەدا کۆ بووبوونەوە و وتاری پەیکەری گومانیان راستەوخۆ دەگواستەوە بۆ ئەو شاشانەی لە سەرانسەری شازلاندا دانرا بوون. خڕبوونەوەی میدیاگەل لەبەر پرۆفێشناڵییان نەبوو لە سووچێك کۆ بووبوونەوە، بگرە لە ترساندا کەس نەیدەوێرا بێتە پێشەوە. ریزی پێشەوەی

هۆڵەکە، هەموویان، پیاو ماقووڵ، پیاوی زانست، پیاوی ئەدەب، ریش سپی و بە ئەزموونانی شازلاند بوون. هەر هەموویان بە دانیشتنیشەوە دەستیان لەسەر سنگیاندا بوو. لە پشتی پەیکەری گومان سێ پیاو وەستا بوون، بە هەرسێکیان یەك شاخیان دروست کرد بوو. هێندە مڕ و مۆچ، ناشرین و قێزەوەن بوون پەیکەرێك بوون لە ترس و تۆقین.

## ٤

پەیکەری گومان مایکەکەی پێکرد و دەستی کرد بە قسە. ئەمەی خوارەوە کورتەی وتارەکەیەتی کە بەبۆنەی هەڵبژاردنی بە سەرۆکی دەستەی گومان پێشکەشی کرد:

***"من دەتوانم بتانپارێزم، تەنیا من. هەر یەکێك بیەوێ شازلاند تێك بدا، ئەوا پارچە پارچەی دەکەم، تێك و پێکی دەشکێنم. نەك بیەوێ، تەنانەت خەونیش بە لاچوونی من، یان تێکچوون ببینێ، ئەوا لەداری دەدەم. ئەم خەباتە لە باووباپیرانمەوە بۆم ماوەتەوە، کەس ناتوانێ لەم رێچکەیە بەلارێمدا ببا. هەوڵی هیچ شێواندن و لادانی من یان تێکدان یان خۆپێشاندانێك مەدەن، چونکە من سیستمێکی کۆنترۆڵی ویست و سۆز و بیرکردنەوەم داناوە. شەوان ئەم ئامێرە بەسەر هەر ناوێکدا بهێنم، یەکسەر ئامێرەکە پێم دەڵێ ئاخۆ ئەم کەسە نیازی چی هەیە و چی نییە. بۆیە من ئاگەدارتان دەکەمەوە، لەوەی کە کەس بیر لە شتێ نەکاتەوە بیخاتە ژێر گومانەکانی من. هەروەك دەزانن، درەختێکی گەورە، بە سەتان لك و پۆپ، لە دڵی مندا گەشە دەکا. ئەوە درەختی گومانە.***

*لەم ساتە بەدواوە، هەر یەکێك لە ئێوە کۆمپانیاییێکی دانا، دەبێ پشکێکی بۆ من بێ. هەر کەسێك کارگەیەکی کردەوە، دەبێ پشکێك پێشکەشی من بکا. هەر بازرگانێك بیەوێ وەبەرهێنان بکا، جا لە هەر بوارێکدا بێ، دەبێ رەزامەندیی من وەرگرێ و پشکێکی باش بۆ من دابنێ. لەوانەیە بپرسن، باشە، بۆ من پشك وەردەگرم، ئاخۆ مافی ئەوەم هەیە، من چ پەیوەندیم بەوەوە هەیە؟ بەڵێ مافم هەیە، زۆریش پەیوەندیم پێوە هەیە. بێنە بەرچاوت ئەگەر یەکێك بیەوێ وەبەرهێنان بکا و دواتر لەبەر نەبوونی ئەمن و ئەمان، پارەکەی بچێ لە ئاو. ئەوە منم هەموو شتێك دەپارێزم و ناهێڵم کارەکەتان هیچی بەسەر بێ، بۆیە منیش دەبێ پشکم هەبێ و سوودێك ببینم. هەروەها خاڵێکی تر هەیە دەمەوێ پێتانی رابگەیەنم، ئەویش ئەوەیە: ئەو دەستەی من سەرۆکایەتی دەکەم، هەر یەکێکی دەسگیر کرد، کەس بۆی نییە لێی بپرسێتەوە، یان فزەیەك بکا و بڵێ چی بەسەر هات. زۆر باش ئاگەدارتان دەکەمەوە کەوا کەس دەست نەخاتە کاروباری من، ئەوەی من دەیکەم، تەنیا من، بۆ پاراستنی ئێوەیە. ئێوەش مەرد بن و لێو مەجوڵێنن."*

لە کاتی پێشکێشکردنی وتارەکەی، ئەندامان سەری ئەرێنیان بۆ رادەوەشاند. هەبوو زەردەخەنەی بۆ قسەکان دەکرد. جارجاریش

چەپڵەیەکی توونديان بۆ لێ دەدا. هەر وەهات دەکرد، یەکێك هەڵدەستاوە یەك بەدەنگی خۆی هاواری دەکرد:

*"بژی شازلاند و بژی گەورەمان."*

## ٥

هەر لەکاتی وتارەکەیدا، گەنجێك هەستایەوە و پرسیارێکی کرد. پەیکەری گومان رای لە پرسیارەکەی نەبوو، بەتۆمەتی ئەوەی قسەکانی پچڕاندووە، هەر بەچاو ئاماژەیەکی بۆ دێوەکانی پشت سەری کرد. ئەوانیش دەسبەجێ بەیەك چنگە دەست و بە شاپان لە هۆڵەکەدا بردیانەوە دەرەوە. گەنجەکە وەك میزەڵان لە ژێر مستوکۆڵەکان هەڵدەبەزییەوە. پاش سێ رۆژ، تەرمەکەی لە دەرەوەی شاری زیندووان بەمردوویی دۆزرایەوە، کەسیش نەوێرا بڵێ لەل.

دوای تەواوبوونی وتارەکەی، هۆڵ بووە چەپڵەڕێزان و گوڵباران. هەر هەموو دەستخۆشییان لێ کرد و تا ناو ئۆتۆمبیلەکە بە چەپڵەلێدان بەڕێیان کرد. وتارەکەی پەیکەری گومان راستەوخۆ پەخش کرا لەسەر هەموو شاشەکانی شازلاند.

## ٦

پەیکەری جوولە لەگەڵ خۆشەویستەکەی لە ناو جەرگەی شاری زیندووان لە کافتریاییێك دانیشتبوون. بەدەم دوو شەربەتی ئەناناسەوە، بەناچاری سەیری وتارەکەی پەیکەری گومانیان دەکرد. چاری چی، سەیری هەر لاییێکت کردبا، هەر شاشە بوو، هەر چۆنێك رووت وەرگێڕابا شاشەکانی دەوڵەتی شازلاندت دەبینی.

"ئەریّ پێم نالێی ئەم خەڵکە چۆن باوەڕ بەم قسانە دەکەن؟" خۆشەویستی پەیکەری جوولە پرسی.

پەیکەری جوولە فڕێکی لە شەربەتەکەی پێشی دا و گوتی: "واز لە باوەڕکردن بێنە چونکە ئەوانە مێشکیان شووراوەتەوە و تووشی تیرۆری مێشك بوونە. ئەی ئەم هەموو چەپڵەیە."

"هەمووی خەتای دووی سوورە،" خۆشەویستی پەیکەری جوولە وای گوت.

پەیکەری جوولە سەیرێکی کرد و پێکەنی، "تۆش مەسەلەی دووی سوور دەزانی؟"

"ئەی خۆت ئەو رۆژە بۆت باس نەکردم."

"ئەها، راست دەکەی."

لەو قسانەدا بوون، یەکێك لە ناو کافتریاکە بە ئاستەم گوێی لە قسەکانی ئەوان بوو. هاتە پێش و پرسی، ئەرێ ئەوە باسی دووی سوور دەکەن.

"دووی سوور؟" پەیکەری جوولە بە پرسیار و سەرسڕمانەوە وای گوت، وا خۆی پێشان دا کە نازانێ باسی چی دەکا.

کابرا زەردەیەکی گرت و گوتی: "کوڕی باش مەترسە، منیش پرسی دووی سوورم بیستووە."

پەیکەری جوولە بەمە هەندێ خۆشحاڵ بوو، چاوێکی لە خۆشەویستەکەی داگرت و بەئاماژە پێی گوت کە ئەویش لەخۆیانە، دواتر بە کابرای گوت، "تۆ چۆن باسی دووی سوورت بیستووە؟"

کابرا بەدەنگێکی بەرز گوتی: "لە گەڕەکەکەی ئێمە، هەموو دەربارەی دووی سوور دەزانن، کەس نییە نەیبیستبێ و نەزانێ دووی سوور چییە و کێیە!"

"تۆ پێت وایە ئەو وتارەی پەیکەری گومان پێشکێشی کرد، راست بێ؟" پەیکەری جوولە پرسی.

"بێگومان نەخێر،" کابرا بە رژدی وای گوت، هەناسەیەکی ساردی هەڵمژی و بەردەوام بوو "هەمووی خەتای دووی سوورە، لە سایەی سەری ئەو، هەرچی مندار و تار هەیە لۆ خۆیان بەناو کەتینە."

پێش ئەوەی بڕوا، کابرا سەری هێنایە بن گوێی چەپی پەیکەری جووڵە و چرپاندی، "دەزانی ئێستە خەڵکێکی زۆر زانیویەتی و داوودەزگەی ئەمنیش بەدوای داهێنەرەکەیدا دەگەڕێن."

"بەڕاستیتە؟"

"بەڵێ خەڵکێکی زۆریشیان بە تۆمەتی داهێنانی دووی سوور گرتووە، بەڵام جارێ زۆر بەنهێنی ئەو کارانە دەکەن."

"تۆ چۆن ئەمانە دەزانی؟"

کابرا پێکەنی و بەپەلە ڕۆیشت.

# ١

له ٢٠٠٦/٢/٢٢دا، پەیکەری جوولە لە بازاڕ دەگەڕایەوە ماڵ. بەدەمڕێوە، بە خێراییێکی بێوێنە، بیری لە چەپەڵی، بێ بەرپرسیارەتیی و ناکەسبەچەیی کاربەدەستانی شازلاند دەکردەوە.

کچێك ئاسکئاسا، ئاگرپارە و بزۆز لە بەرامبەرییەوە بەرەو رووی دەهات. کاتێ برووسکەئاسا چاوی بەلێوەکانی کەوت، لەعلی هاتە پێش چاو. بەنیگای کتوپڕی چاوە گەشەکانی پەیکەری جوولەی تا سەر ئێسقاند تاساند. بەو دیتنە دەسبەجێ خێراییی رۆیشتنەکەی هێور بووەوە، لەشی گران بوو. بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێکی تر بکاتەوە، رووی وەرگەڕاند و بەدوایدا چوو.

"پێی دەڵێم، تۆ ئەو دڵۆپە بارانەی دەکەویتە ناو سکی سەدەف، دواتر دەبی بە مرواری،" بەدەم رێوە ئەو رستەیەی بەبیردا هات . نوقمی خەیاڵ، مەستی و جوانی لێوەکانی ئەو بووبوو. لەپڕ چاوی هەڵێنا، بینی لەعل وا خۆی بە ئاڕاستەی ئەو پێنگاو دەنێ. لە پڕ هەستی کرد وا بە قوڵنگان دەیشێلن، لەبەرئەوەی هەڵوێستێکی کتوپڕ بوو.

بەدوو پێنگاوی ئەو و سیانی کچەکە گەیشتنە بەردەم یەکتر.

" زانیم دەگەڕێیەوە !" دەمی پەیکەری جوولە تەتەڵەی کرد و ئەم رستەیەی لێ دەرپەڕی. بەو قسەیە بسکاندی. ئەویش هێندەی نەمابوو باڵ بگرێ، وای زانی ئێستا دەستی دەگرێ و بەرەو دوور دەیبا. نوقمی خەیاڵەکانی بووەوە.

"من هەرەسی کێوم بۆ کەس ناگەڕێمەوە!" بەم قسەیە پەیکەری جووڵەی بێدار کردەوە لە خەیاڵەکان و تاساندی. ئەوجا جرتەی لێوەهات لە تەکییەوە ئاسکئاسا دەرچوو.

## ٢

پەیکەری جوولە تەماشای کرد تا لەبەرچاوان ون بوو. هەر لە نیگای یەکەمدا خۆشیویست. بۆ ماوەیەك هەرچی خەمی ولات هەبوو لە بیری کرد. شەو و رۆژ بیری لەو کچە ئاسکئاسایە دەکردەوە کە لە ٢٠٠٦/٢/٢٢دا لە بازاڕ لە تەکییەوە تێپەڕی. ئەو شەوەدا تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. بیر، هزر و خەیاڵی تەنێ لای ئەو کچە بوون. کچ چ کچ: جوانترین کچ لە نێو هەموو کچان دا. لێوی: لێو چ لێو، جوانترین لێو لە نێو هەموو لێوان دا. لێوی گوڵە هەناری سووری بەستوو، ترسناك بەلام ئەوپەڕی جوان. چاوی: چاو چ چاو جوانترین چاو لە نێو چاوان دا. چاوی شینی یاقوتی بریسکەداری تێکەڵەڕەنگ، سیفەتی موگناتیسی هەبوو، پەیکەری جوولەی لەوسەری دنیا بۆ خۆی کێش دەکرد. برژانگی: برژانگ چ برژانگ جوانترین برژانگ لە نێو برژانگان دا، هێند درێژ و نەرم، وەك ئالایەکی شکۆدار لەگەڵ هەر کزە بایەك دەشەکایەوە. ئەو هەموو جوانییە پەیکەرێك لە جوانی و خۆشەویستییان لای پەیکەری جوولە دروست کرد. هەر لەو رۆژەوە عەشقی ئەو کچە بوو و ناوی نا پەیکەری خۆشەویستی.

## ٣

بۆ ماوەی ١٢ ڕۆژ، هەموو ئێوارەیەك لە هەمان ئەو كاتەی ئەو ڕۆژەی كچەكەی تێدا بینی، پەیكەری جوولە لە هەمان شوێن چاوەڕێی دەكرد بۆ ئەوەی بتوانێ جارێكی تر بیبینێتەوە. هەموو ڕۆژ تا درەنگ دەمایەوە، پاشان بە دڵساردی و پڕ لە كەسەر دەگەڕایەوە ماڵ.

ڕۆژی سێزەدەهەم، هەمان كچی لە هەمان شوێن بینییەوە. كاتێ چاوی پێی كەوت، دڵی داخورپا، لەرزی و ئەژنۆی شكا. پەیكەری جوولە خەمی تەواوی شازلاندی لە كۆڵ بوو، بەڵام خۆشەویستیی بۆ ئەو بارێكی تر بوو: بارێك چەند قورستر بێ هەڵگرتنی هێندە ئاسانە! شەیدایی و خولیای ئەو كچە هەندێ جار هەموو خەمێكی هەڵدەوەراند.

دیمەنەكە بەم شێوەیە بوو:

***پێی گوت: كە دڵۆپە ئاوێك دەكەوێتە ناو دەریایەك، هیچ سەروشوێنی نامێنێ. منیش دڵۆپێك ئاوم لە ناو دەریای عەشقی***

***تۆدا.***

***کیژۆڵەش بزەیەکی کرد. دەمی وەك خونچەیەکی تازە پشکوتو دەرچوو.***

***پێی گوتەوە: رەنگم لەچاو ڕەنگی روومەتی ئاڵ و جوانی تۆوە شەرمەزارە.***

***کچەکە نیگایەکی کرد و هومائاسا تیرێکی تێسرەواندە شانی راستی.***

***"بەتیری چاوەکانت هەم دنیا و هەم دینم لە دەست دەدەم،" بێباکانە ئەمەی لەدەم هاتە دەر و ئینجا هەڵیدایەوە: "چی بڵێی من بەشەکر حسێبی دەکەم."***

***کچەکە لووتبەرزانە هەنگاوێك کشایەوە و گوتی :تۆ و من وەك تاڵێکی ئاوریشم و پەتێکی ئەستوور واین. تۆ لە دۆڵێك دەخوێنیت و منیش لە دۆڵێکی تر.***

***"دڵرەقی ئەم ئێراکە دەیان شاخ خورد دەکاتەوە!"***

پەیکەری جووڵە ئەمەی بەخۆ گوت، سەرێکی بادا و پیشێکی بێئومێدی خواردەوە. دواتر وەك بڵێی دوا وەرەقەی بەکار بێنیٚ، هەموو هێز و توانای خستەگەڕ و پێی گوت، "من تۆم خۆشدەویٚ!"

پەیکەری خۆشەویستی بەفیزێکەوە نیگایەکی کرد و دواتر سەری دادایەوە و وەك کچێکی بەناز و شەرمن خۆی نواند.

"تکایە بیری لێ بکەرەوە،" پەیکەری جوولە بە پەرۆشەوە پێی گوت.

٤

پەیکەری خۆشەویستی پێی گوت کاتێکی زۆری دەوێ بۆ بیرکردنەوە. پەیکەری جوولەش بەوە رازی بوو و پێی گوت دەتوانێ شەش ساڵی تریش بوەستێ. بەم قسەیەی تێکەوت. ماوەی مانگێك تێپەڕی پەیکەری خۆشەویستی وەڵامی نەبوو، تەنانەت دەریش نەدەکەوت. دوای ئەو ماوە زۆرە، رۆژێك لە هەمان شوێن و لە هەمان کات هەردوو پەیکەر چاویان بەیەکتر کەوتەوە.

" راستە گوتم شەش ساڵ دەوەستم، بەس نەمگوت ئاوا لەسەر سك رامکێشە،" پەیکەری جوولە بەم گازندەیە دەستی پێکرد.

"ببورە ناتوانم."

"تکایە روونی بکەوە، مەبەستت چییە؟"

"هیچ هەستێکم بۆ تۆ نییە، ناتوانم دروستیشی بکەم،" پەیکەری خۆشەویستی ئەم قسەیەی کرد و هێواش هێواش رۆیشت.

پەیکەری جوولە، دیسان، تا لەبەرچاوان ون بوو تەماشای کرد. تفی کەسەری قووت دایەوە و یەك دلۆپە فرمێسك لەچاوی راستی رژایە سەر روومەتی ئاڵی. پاشان وردە وردە دنیا لەبەر چاوی تاریك بوو، رێك لە شوێنی خۆی دانیشت و بڕستی لێ بڕا.

## ٥

دوای چەند رۆژێك، پەیکەری جوولّە بەلای پۆلێك کچدا تێپەڕی. قاقای کچەکان ئەو ناوەی پڕ کرد بوو. ئەویش سەری هەڵبڕی. چاوی نیشتەوە لەسەر تەنیا رووێکی مانگئاسا، لە کاتێکدا چەندان مانگی تر ئەو ناوەیان رووناك کرد بوو. بەڵام خۆر تەنیا بۆ ئەو مانگەی چاوەکانیی داگیر کرد کڕنووش دەبات، ئەوانی تر مانگی بێ خۆر بوون. پەیکەری جوولّە سڵی لە دەوروبەری نەکردەوە چووە بەردەمی. گفتوگۆی نێوانیان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو.

"تۆ چۆن لە خۆشەویستی گەیشتووی؟" پەیکەری جوولّە پرسی.

"دەبێ بتهەژێنێ!"

"نەخێر، خۆشەویستی دەبێ دروستت بکا."

"چۆن؟"

"ئەگەر دروستت نەکا، ناتهەژێنێ. دروستت نەکا وێران، کوێر، فاشلت دەکا."

"منت خۆش دەوێ؟"

"دڵنیام لە خۆمم خۆشتر دەوێی."

"کوا چۆن دروست بووی؟"

"من بەهۆی خۆشەویستی تۆوە فێری ئەوە بووم بڵێم نا."

کچەکە لەگەڵ هاوڕێکانی دایان لە قاقای پێکەنین. دواتر گوتی "جا ئەوە چییە، هەموو کەس دەتوانێ بڵێ نا."

"نەخێر، ئەوانەی دەڵێن نا دەگمەنن. نا بۆ دڕندایەتی، بۆ خیانەت لە گەل و نیشتمان، گەندەڵی."

"گوتنی نا هیچ پەیوەندی بە دروستبوونەوە نییە."

"پەیوەندییێکی قووڵی پێوە هەیە. ئەوانەی تەنیا دەڵێن مرۆی بوودەڵە، شەرمن و ترسنۆکن. دەترسن بە "نا"یەك هەموو شت لە دەست بدەن. من لەوەتەی خۆم دەناسم، هێزی خۆشەویستیی تۆ وای لێکردووم بە هەموو ناهەقییێك بڵێم نا. ئەوەی من بەنیازم بیکەم نەك هەر تەنیا خۆم بگرە وڵاتیش دروست دەکا."

## ٦

دوای شەش مانگ بیرکردنەوە لە قسەکانی پەیکەری جوولە، پەیکەری خۆشەویستی سۆز و خۆشەویستی بۆ پەیکەری جوولە دروست بوو. بەڵام هەر رازی نەبوو.

## ٧

***"با تەنیا دوو خولەك لە ژیانت بۆ من بێ، دواى ئەو دوو خولەکە هەموو ژیانت پێشکێشی من دەکەیت،"*** پەیکەری جوولە وای بە خۆشەویستەکەی گوت.

ئەمە قێزەوەنترین جۆری تەقدیمکردنە ناچار بوو پەنای بۆ ببات. چاوەکانی لێکناو بەفیزێکەوە گوتی: "نا بابە، ئەوە چییە دیسان".

" وەرە با گرەو بکەین، چاك دەزانم دوای ئەو دوو خولەکە خۆت تەواوی ژیانت دەدەی بەمن،" پەیکەری جوولە بوێرانە لێی چووە پێشێ و پێی گوت.

پەیکەری خۆشەویستی لە نێو کچەکاندا کەیفی بەخۆی هات و هەستی بە گەورەیی کرد. بەم گەمەیە پێکەنی. نەیدەزانی پەیکەری جوولە لەو دوو خولەکەدا چی دەك، یان ئەوەتا زۆر لەو باشتر دەیزانی چیی لێ دەکا. چاوی لە چاوەکانی دانەگرت. چێژی لە تەماشاکردنی وەرگرت و گوتی:

"ئەوە هەفتەیەك، بیر لەو گرەوە بکەوە، ئەوجا وەڵامم بدەوە".

هێشتا پەیکەری جووڵە قسەی تەواو نەکرد بوو، پەیکەری خۆشەویستی خێرا گوتی "من ئەو گرەوە ناکەم".

"باوەڕت هەبێ، پێش ئەوەی دوو خولەکەکە تەواو بێت، خۆت پێشکێشی من دەکەیت،" پەیکەری جووڵەی بەلەسە باوەڕی بەو گرەوەی خۆی هەبوو.

پەیکەری خۆشەویستی هیچی نەکرد تەنیا پێکەنی، نازدارانەتر خۆی نواند.

لە تەواوی هەفتەکەدا، هەموو رۆژ خەونی بەو دوو خولەکەوە دەبینی. خەونی جۆراوجۆر و رەنگاورەنگ. لە خەونەکان خۆشتر، ئەو خەیاڵە بوو کە پەیکەری خۆشەویستی دەستی گرت و رفاندی. بردی بۆ پەنایەك و بەنەرمی گوتی:

***"دەی، ئێستە دوو خولەك هی تۆم، بزانم چی دەکەی!؟"***

بەو قسەیە دڵ کەوتە لەرزە، لە دوو خولەك ئەم یارییەی کرد:

***١٠ چرکە بەس تەماشای کرد.***

***لەو ماوەیەدا بەچاو دەیگوت تۆ جیاوازی، بۆیە دوو خولەکم پێشکێش کردی.***

***١٠ چرکە بەس بۆنی کرد.***

*بۆن چ بۆن، خۆشترین بۆن لە ناو هەموو بۆنەکانی دنیادا.*

*١٠ چرکە بەس لە باوەشی گرت.*

*پەیکەری خۆشەویستی چاوەکانی لێکنا و هەستی بە ئارامی کرد. خۆشحاڵبوو بەوەی کە ئەوە یەکەم جارە باوەشی پیاو دەبینێ.*

*١٠ چرکە نێوچەوان، ڕوومەت، گوێچکەکان، چاوەکان، برۆ، لووت، تەواوی سیمای پەیکەری خۆشەویستی ماچ باران کرد.*

*٣٠ چرکە بەس لێوی مژی. کەمێك شڵەژا. دەستی لەناو قەدی گیرکرد و توند بەخۆیەوە نووساند.*

*هەردوو پەیکەر هەستیان بەوە کرد لە ناو یەکتردان. لەو بیست چرکەیەدا فێری پەیکەری خۆشەویستی کرد کە ئەو دەبێ لێوی سەرەوەی بمژێت و ئەویش لێوی خوارەوەی ئەو، جارجاریش زمانی یەکتر.*

*٢٠ چرکە بە گەردن و سینگ و پشت مل و سێوە سەرمۆرەکانیدا دا هەڵزنا و لێستییەوە و بەهێمنی دەیمژی.*

*هەموو گیانی پەیکەری خۆشەویستی گەرم داهات و تووند پەیکەری جووڵەی لەباوەش گرت، بەجۆرێك دەستەکانی لە ئێسکیدا چوونە خوارەوە.*

***پەیکەری جووڵە ویستی ئەو ٣٠ چرکەی کە ماوە بچێتە خوارەوە و بەزمان ئەو فستقە بلێسێتەوە و بمژێ کە دەمی بەئاستەم لێك کردبووەوە.***

***بەڵام پەیکەری خۆشەویستی خۆی بۆ نەگیرا و هاواری کرد:***

***"من هەموو ژیانم بۆ تۆیە!"***

دوای هەفتەیەك، پەیکەری خۆشەویستی هات. پەیکەری جووڵەی رفاند و بردیە پەنایەك. گوتی "ها ئەوە دوو خولەك هی تۆم، بزانم چی دەکەی."

پەیکەری جووڵەش نەیکردە نامەردی، خەون و خەیاڵی کردە راستی. پێش سی چرکەی کۆتایی، پەیکەری خۆشەویستی خۆی تەسلیمی پەیکەری جووڵە کرد.

## ١

لە بەیانی ٢٠١٠/٢/٢٢دا، پەیکەری جوولّە تەلەفۆنێکی بۆ هات. پەیامی زەنگەکە ئەمە بوو: "تکایە ئێوارە سەعات چار وەرە پارکی کەران، دەمەویّ بتبینم، زۆر پێویستە."

پارکی کەران دەکەوێتە ناوەڕاستی شاری زیندووان. رووبەرێکی فراوانی داگیر کردووە. لە ئاسمان، تەنیّ ئەویّ سەوز سەوز دەچێتەوە. دوای ئازادی و رووخانی دیکتاتۆر، باوکی شاخبڕ بڕیاری دروستکردنی ئەم پارکەی داوە. باوکی شاخبڕ یەکیّ بوو لە سەرە گەورەکانی ولاّتی شازلاند. لە ژیانیدا، تاکە کاری باشی ئەم بڕیارە بوو، تەواوی کارەکانی تری چ نەبوون جگە لەسەرخواردنی خۆی.

پارکی کەران چوار دەروازەی گەورەی هەیە. لەسەر هەر دەروازەیەکدا پەیکەرێکی گەورەی کەر دروست کراوە. ئەو پەیکەرانە هێند گەورەن لە دوورەوە دەبینرێن و دەناسرێنەوە. لە تەك هەر درەختێکی ناو پارکی کەران پەیکەرێکی کەر دروست کراوە. هەندیّ جار وا هەست دەکەی چوار دەورت هەمووی کەرە و

هاتوویته مەیدانی کەران. هەندێ جار لەبەر سەلکە کەران کەسی تر نابینی.

دەڵێن کاتی خۆی دیکتاتۆر و دارودەستەکەی هێندە خەڵکی شازلاندیان لێ کوشتووە، دەریاچەیەك لە خوێن دروست بووە. بەڵام دوای رزگاربوون، کاربەدەستانی شازلاند، یەکێ لە کارە باشەکانیان، کە کەم کاری باشیان هەبووە، وشك کردنی ئەو دەریاچە خوێنینە بوو و لە شوێنیدا ئەم پارکەیان دروست کرد. ئەویش باوکی شاخبڕ نەبوایە هەرگیز دروست نەدەکرا، چونکە خۆی چرکە بە چرکە لە دوای بوو تا هاتە تەواوکرن.

## ٢

پەیکەری جوولّە سەعات چواری رێك لە ژێر درەختێك، لەسەر کورسییێکی دار، لە تەك پەیکەرێکی کەر دانیشتبوو و چاوەڕێی پەیکەری خۆشەویستی دەکرد کە بەیانی زوو تەلەفۆنی بۆی کرد بوو بێ و بۆ کارێکی پێویست و گرنگ چاوی پێی بکەوێ. دوای چەند خولەکێك، پەیکەری خۆشەویستی بە دیارکەوت و چاوەکانی وەگ گۆمی خوێن، سوور سوور، مەند مەند، پڕ لە فرمێسك، رووی کرژ کرژ بوو. هەرکە گەیشتێ و نەگەیشتە شوێنی مەبەست تەقییەوە. وەك گڕکان چاوەکانی فرمێسك و خوێنیان لێ دەردەپەڕی. هات لە تەك پەیکەری جوولّە دانیشت و تێر گریا، پاشان سەری بەشانی کرد و گوتی: "هەرگیز چاوەڕێی ئەم رۆژەم نەدەکرد."

پەیکەری جوولّە بە دەسرازەیەکی سوور فرمێسك و دەموچاوی وشك کردەوە، کەمێك تەماشای چاوەکانی کرد، ئەوجا گوتی: "بۆ خێرە؟ خوانەخواستە هیچ نەبووە؟"

"ماڵمان وێران بوو، هەرگیز باوەڕ بەمە ناکەم."

"تکایە پێم بڵێ بزانم چی بووە، بەس ئەوەندە بگری، خەریکە وشك دەبییەوە،" پەیکەری جوولە، کێرقی نیگەرانی لە ترۆپك بوو، وای گوت.

"دوێنێ سەعات نۆی شەو، کۆمەڵێك چەکدار، گوایە سەر بە دەستەی گومانن، هاتن براکەمیان لە دوورڕ ماڵێ هێنایە دەرەوە و هەر بە شەق بردیان . . .،" گریان قسەی پێ بڕی.

## ٣

پەیکەری جووڵە هیچی نەگوت لەم ساتەدا، بواری پێ دا بگری تا دڵی پاك دەبێتەوە و بتوانێ قسە بکا. پەیکەری خۆشەویستی بە گریان و هەنسکەوە سەری بەسینگی پەیکەری جووڵە کرد و هۆڕ هۆڕ دەگریا.

پەیکەری جووڵە دەستی بەسەر سەریدا دەهێنا بۆ ئەوەی بەئاماژە و جووڵە بەشدار بێ لە خەمەکە و هاوکاتیش دڵی بداتەوە. هەر بەردەوام بوو لەسەر دەستبەسەرداهێنانی گوتی: "ئازیزەکەم، تکایە وردەکارییەکانم پێ بڵێ، بۆچی براتیان برد، هیچی کرد بوو؟"

٤

برای پەیکەری خۆشەویستی گەنجێکی لەشڕێك، گەنمڕەنگ، قژ تاتا، توندوتۆڵ و قۆز بوو. پێیان دەگوت پەیکەری رواڵ، هێندە رووی ئاڵ و گەش بوو، پەیکەرێکی لە گەشی و رووی ئاڵ دروست کرد بوو. پەیکەری رواڵ موزیکژەن، هێمن و مات بوو. لەشی هێندە تۆکمە و توندوتۆڵ بوو دەتگوت گلادیەتەرەکانی سەردەمی رۆمانییەکانە، لەم وێنەیەدا هەرگیز بە موزیکژەن نەدەچوو.

١٢ ئۆتۆمبیلی گەورەی جامڕەشی بێ رەقەم شەو سەعات نۆ بەجرت و فرت و تەڕناش هاتنە بەر دەرگە. بێ ئەوەی لێی بدەن، وەژووریێ کەوتن و بێ پرس هەموو شتێکیان لە ماڵەکەدا سەراوژێر کرد. وەك بڵێی بەدوای دەرزییێکدا دەگەڕێن، تەنانەت بن فەرش و دۆشەکیش دەگەڕان.

داییاب و خوشکی تۆقین. تۆ بێنە بەرچاوت، بەم شەوە، بیست زەلامی چارشانەی ناشرینی قێزەوەن و روو کرژ بەخۆیان و تفەنگی دەستیان لێت وەژوور کەون، بێ ئەوەی پرست پێ بکەن هەموو ماڵەکەت لێ تێکوپێك بدەن.

پەیکەری رواڵ لەسەرەوە خەریکی راهێنانی موزیك بوو، ئاوازی پاکی و بێگەردی دەژەنی. زەلامەکان سەدای موزیکەکەیان بیست، بەپەلە هەر هەموویان چوونە ژوورەکەی سەرەوە. وەك بڵێی جەرگ و دڵیان لە ئاسن دروست کرابێ، تۆزقاڵێك نەجوڵان بە موزیکەکە. بەلێدان و کوتان پەیکەری رواڵیان تا ناو یەکێ لە ئۆتۆمبیلەکان برد. دایباب هێندە هاواریان کرد و پرسیان بۆچی کوڕەکەیان دەبەن و چی کردووە. کەس نە قسەی کرد و نە ئاوڕیشیان لێ دانەوە.

## ٥

پەیکەری جوولە، توووند هەردوو شانی پەیکەری خۆشەویستی گرت و رایهەژاند و گوتی، "بۆچی براتیان بەم شێوەیە برد، نالێن لەسەر چی؟"

"دەڵێن گوایە دەستی هەبووە لە تێکدانی هێلانەی کۆتر؟"

"هێلانەی چی؟"

"نازانم!"

"هەر ئەوەندە؟"

"بەڵێ."

"ئێ باشە ئەوە ئەو گریانەی دەوێ؟" پەیکەری جوولە هەناسەیەکی هاتەوە بەرێ و وای گوت. ئەو بیری بۆ تیرۆر یان کوشتنی سەرۆك دەچوو!

"من بۆ ئەوە ناگریم،" پەیکەری خۆشەویستی سەری بڵند کرد و فرمێسکەکانی، وەك خوناوکە بوون، سڕییەوە.

پەیکەری جوولە رەنگی پەڕی، شێوا، رووی کرژ بوو، مۆن بوو، بەدەنگێکی نووساوەوە گوتی، "ئەی بۆچی؟"

"دوای ئەوەی بردیان، من و دایبابم چووین بۆ بارەگای دەستەی گومان و ئاسایش، گوایە لای ئەوانە...،" دیسان قسەی بۆ تەواو نەکرا و دەستی کردەوە بە گریان.

پاش ماوەیەك وەستان، بەردەوام بوو لە قسە و گوتی، "ئەوەی من بینیم و بیستم لەو شوێنە، یاخوا کەس نەیبینیٚ و نەیبیستیٚ..."

## ٦

دوای بردنی براکەی، پەیکەری خۆشەویستی و دایبابی بەدوای پەیکەری روالّدا دەچن. بارەگاکە لە سیم و درِك دروست کراوە. هێندە قێزەوەن و تۆقێنەرە، باوەڕ ناکەم هیچ دڕندەیەك بوێرێ، نەك بچێتە لای، تەنانەت سەیریشی بکا. هەرکە گەیشتنە ئەوێ، بەتۆنێکی تووڕە، بێ رێز و تژی لە گومان پرسیان: "بۆ کوێ؟"

پەیکەری خۆشەویستی پێی گوتن بەدوای براکەیاندا هاتوون و دەیانەوێ بزانن مەسەلە چییە. گوایە پڕۆسەی چوونە ژوورەوە وایە، دایبابیان هەر لە پرسگە دڕکاوییەکە هێشتەوە و پەیکەری خۆشەویستیان ئیزن دا.

٢٢ ژووری کرد تا گەیشتە ئەو کەسەی گوایە بەرپرسە لە کەیسی براکەی. دەچووە هەر ژوورێك دەیپرسی، پێش ئەوەی وەڵامی بدەنەوە، هێندە چلێس و پیسکە و ناشنا تەماشایان دەکرد وەك بڵێی هەرگیز ئافرەتیان نەبینیبێ. وەك بڵێی خۆیان دایك و خوشك و ژنیان نەبێ. بێ شەرمانە، بێ روو و بێ رێزانە بەتۆنێکی شەهوەتبازانە و هەوەسبازانە پێیاندەگوت کەیسەکە لای ئەوان نییە.

## ٧

بەرپرسی ژووری بیست و دووەم مرۆییێکی دڵڕەق و چاو حیز، بەژن مامناوەندی زڕتەك، سەرخڕی کەچەڵ، ورگ زلی لووت فش، زلحۆرتێکی قوتەبنە. دە خولەکی یەکەم تەنیا بەچاوێکی هەوەسبازانە تەماشای بەژن و باڵای زراڤ و چاوی پەیکەری خۆشەویستی کرد. چاوەکانی دوو زنە بوون تژی لە رۆندك. وێڕای کەسەری گرانی، شلك و شاقەڵشۆڕی سەربەمۆر خۆی پێشان دەدا. تەنیا بەچاو ئاوسی کرد! وەك بڵێی دێوێکە و سەت ساڵە تامەزرۆی ئافرەتە. شابسکی هەر بەچاو ئاگر تێبەر دا.

پەیکەری خۆشەویستی یەکسەر دەستی بەگریان کرد و لێی پاڕایەوە براکەی بەر بدات. ئەویش بەچاوێکی حیز و دەنگێکی گەلۆرانە پێی گوت کەوا براکەی دەستی لە تاوانێکی گەورەدا هەیە، ئەویش هەوڵی داوە هێلانەی کۆتر لەسەر رێی ماڵی دووی سوور تێك بدا.

پەیکەری خۆشەویستی ویستی بڵێ باشە ئەمە تەنیا هەوڵدانە، خۆ هێشتا تاوانەکەی ئەنجام نەداوە. باشە، دەیگرن بیگرن، بەڵام بۆ بەم شێوەیە. دەبوایە دوو پۆلیسی بەڕێز بنێرن، فەرمانی

دادگەیان پێ بێ و بەڕێز و حورمەتەوە بیانبردبا. ویستی بڵێ تەنیا بەم وێنەیە کەرامەتی براکەم و ئێمەشتان شکاند. ویستی بڵێ کەی ئەمە تاوانە ، کە تەنیا هەوڵدانە و هێشتا لەسەریشی ساخ نەبووەتەوە، جارێ تەنێ تۆمتبارە، لەچاو ئەو تاوانە گەورانەی جەنابتان و سەرووی خۆتان دەیکەن. بەڵام تفی حەژمەت و مەراقی قووت دایەوە لەجیاتی ئەمانە گوتی:

"کەی دادگەییکردنی دەست پێ دەکا؟"

## ٨

چاوحیزی نمەك حەڕامی چلێس، کە دەتگوت پەیکەری چلێسییە، پێی گوت دادگەی چی و حالّی چی، دەبێ جارێ لە زیندان بکەوێ و بڕزێتەوە، ئەوجا خەمێکی لێ دەخۆن.

پەیکەری خۆشەویستی، چاوەکانی پڕ فرمێسك، قوڕگی گران بووبوون، ویستی بڵێ ئەی بۆ ناچی سەرووی خۆتان بگرن کە وڵاتی شازلاندیان بەجارێ ساختە کردووە، هیچ نەما نەیکەن بۆ پڕکردنی گیرفانیان، وڵات، شەڕەف و کەرامەتی خۆیان و گەلەکەیان فرۆشت. بەڵام لێوی کرۆژت و تفی خەمی قووتدایەوە، بەدەنگێکی خەمناك پرسی: "باشە ئێستە ئێمە دەبێ چی بکەین؟"

پەیکەری چلێسی، هەستایە سەر پێ، تا نزیکی ئەو هات، زەردەخەنەیەکی شەهوەتبازانەی هاتێ و گوتی،" خانمەکەم ئەوە زۆر ئاسانە، دەتوانی ئێوارەیەك لەگەڵ من پیاسەیەك بکەی و دواتر هەر ئەو ئێوارەیە براکەت بەر دەبێ."

دوای بیستنی ئەم قسەیە، پەیکەری خۆشەویستی یەکسەر ژوورەکەی جێهێشت و بەپەلە بەرەو پرسگە رای کرد. کە گەیشتە ئەوێ، پەلی دایبابی گرت و بەپەلە بردنییە دەرەوە.

## ١

له ٢٠١٢/٢/٢٢دا، له سەعات دووی شەو، ورگ ئەستورێك له ناوەڕاستی شەقام كەوتبوو، مرخە مرخی رۆژە رێیەك دەڕۆیشت. سەر زلێكی تر لەسەرە فەرعی هەمان شەقام كەوتبوو، وەك بەراز دەیبۆڕاند. پێنج مەتر ئەولاتر، دوو ورگ ئەستووری تر، كە قات و ریباتیان لەبەردا بوو، كەوتبوونە سەر دەم و دەڕشانەوە. ئەوانەی لەسەر شەقام كەوتبوون، هیچ مرۆی ئاسایی نەبوون، بگرە هەر یەكە لە وڵاتی شازلاند پۆستێكی گەورە و تژی له بەرپرسیارەتی هەبوو.

پەیكەری جووڵە، سەعات دووی شەوی هەمان رۆژ له كتێبخانەی گشتی دەگەڕایەوە ماڵ، كاتێ بەلای هوتێلی فیرعەونەكاندا چوو، ئەم ورگەستوورانەی بینی. له یەكێكیان نزیك بووەوە، لێی چووە پێش و زیاتر لێی ورد بووەوە، ناسییەوە: وەزیری نەزانی ژمارە ١٥ بوو.

چووە لای یەكێكی تر، بینی یەكێكە لەو كاربەدەستانەی وڵات كە بەڕۆژ مرۆ شەرمی لێ دەكا قسەی لەگەڵدا بكا. ئەوێی بەجێهێشت و چووە كۆڵانێكی تر، ئەوێش، پڕ بوو له كەسانی قات

و ریباتلەبەری سەر ئەسلەحی ورگ ئەستوور و بەژن قووت. خێرا چووە شوێنێکی بەرزی ئەو گەڕەکە، بینی ئەم ناوە پڕ بووە لەو جۆرە کەسانە و لێی کەوتوون. هەر هەموویان سەرخۆش بوون.

لە سەعات دەی شەو چوو بوونە یانەی هوتێلی فیرعەونەکان، تا دووی شەو خەریکی خواردنەوە بوون. دوای هاتنە دەرەوە، هەر یەکە بەلاییێکدا چوو بوو، کەس ماڵی خۆی پیێ نەدەزانییەوە.

یەکێکیان گۆرانی دەگوت، یەکێك هۆڕ هۆڕ دەگریا، یەکێکی تر هەنسکی دەدا، ئەو دەڕشایەوە، ئەوی تر قاقای پێکەنینی دەگەیشتە ئاسمان. هەر هەموویان پەیکەرێکی قێزەوەنی سەرخۆشییان دروست کرد بوو. پەیکەری جووڵە لە دڵی خۆیدا گوتی:

***"ئەی خوایە، هەر ئەو سەرخۆشانەن بەڕۆژ وڵات بەڕێوە دەبەن!"***

## ٢

هەندێ لەو کاربەدەستە سەرخۆشانە، دەستی یەکتریان گرت بوو گۆرانیان دەچڕی و شاییان دەکرد. ئەمە چەند دێرێکی گۆرانییێکە:

***وەرە ئێرە، مەزاتخانە***

***وەرە ئێرە کەری بانە***

***وەرە ئێرە کچ بەلاشە***

***چەند خۆشە مەی بەلاش بێ***

***چەند خۆشە مەی بەلاش بێ***

ئاسمان ئەستێرەبەندان، ساف و بێگەرد، مانگ نیوەی دیار بوو، ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، درەوشانەوەی بێزاری. وەك بلێی کاس بووبن بە بۆنی سەرخۆشەکانی وڵاتی شازلاند. بۆن چ بۆن، ناخۆشترین بۆن لە ناو هەموو بۆناندا. بۆنێکی سەگی تۆپیو، یا بۆنی بۆگەنی کۆمەڵە جورجێکی تۆپیو، یان بۆنی هەرە ناخۆشی یەکێك لە بیرە گووەکانی یەکێ لە وەزارەتەکانی وڵات.

## ٣

پەیکەری جوولە لەبەرخۆیەوە گوتی: "ئەی خوایە، کوێری، نادڵسۆزی و نادادوەریی دووی سوور وای لەمانە کردووە، بەشەو سەرخۆش و بەرۆژ سەرکار بن. ئاخر ئەم وڵاتە چۆن بەسەرخۆشان دروست دەبێ."

"هەر بۆیە، بەیانیان تا سەعات ١١ بەخۆ نایەنەوە، سەعات دووی نیوەڕۆ مەزاجیان دەیگرێ ئیمزای موراجیعەکان بکەن و ئیشی خەڵك، ئەویش بەناچلی، بڕوێنن،" دەنگێك لە پشتەوە وای بە پەیکەری جوولە گوت.

ئەویش هیکەکی لەخۆ زانی و زراوی رژا. لەسەرخۆ ئاوڕی دایەوە، پیاوێکی ریش سپی، نورانی، رووگەش و رووخۆشی بینی. پیاوە پیرەکە هاتە پێشەوە و دەستی لەسەر شانی دانا و پێی گوت، "تۆ بەتەنیا نیت، ئێمەش لەگەڵتین."

"ئێوە کێن، مەبەستتان چییە، چی دەکەن بەم شێوە درەنگە لێرە؟" پەیکەری جوولە بەدەنگێکی کز و کەمێك ترسەوە پرسی.

"ئێمە پشتگیری تۆ دەکەین. ئێمە دەزانین تۆ داهێنەری دووی سووریت. ئێمە دەزانین کە دووی سوور سەرچاوەی وێرانکردنی ئەم وڵاتەیە،" پیاوە پیرەکە بەدەنگێکی زوڵاڵ وەڵامی دایەوە.

پێش ئەوەی پەیکەری جووڵە دەست بە قسە بکاتەوە، یەکێك لە سەرخۆشەکان یەك بەدەنگی خۆی کەرئاسا هاواری کرد و بەسەرخۆشێکی تری گوت: "بەیانی تەندەرەکەم بۆ بێنە، ئەگەر بزانم کارێکی باشە، ئەوا بۆت تەوقیع دەکەم و تۆش بەشی منی لێ بدە . . . لە بیرم نەکەی هەی گەوادی گەورە . . . "

پیاوە پیرەکە و پەیکەری جووڵە پێکەوە سەیریان کرد. دواتر پەیکەری جووڵە بەردەوام بوو و دووبارە پرسی: "ئێوە کێن، چۆن لەبارەی دووی سوورەوە دەزانن؟"

٤

"من پێم دەڵێن پەیکەری خەم. دوای سەعات ١٢ی شەوان، من بە نێو شاری زیندووان، شاری مەستی و مەنگدا دەگوزەرێم. کەموکورِییەکان دەبینم و تەنیا خەم دەخۆم،" دەستی لەسەر شانی لادا و بەردەوام بوو، "هەر تەنیا من نیم، ئێستە نیوەی زیاتری خەڵکی شازلاند لەبارەی دووی سوورەوە دەزانن."

"چۆن ئەمە دەزانن؟"

"بەهۆی نووسین، نامیلکە و چالاکییەکانی تۆوە دەیزانن!"

پەیکەری جووڵە بەئاستەم خەنییەوە. پێی خۆش بوو کە ئێستە خەڵکێکی زۆر لەبارەی دووی سوورەوە دەزانن. هەردووکیان وردە وردە بە نێو سەرخۆشەکاندا دەچوون. سەرخۆش هەبوو سمێڵ گەورەی لووت فش، هەبوو تەواو کەچەڵ، هەبوو هێندە قەڵەو بوو، مەگەر تادانۆییێك بتوانێ قیتی بکاتەوە. یەك بەیەك دەموچاوی سەرخۆشەکانیان بەسەر کردەوە، هەر هەموویان ناسینەوە. تۆ بڵێ کێی تێدا نەبوو، تەواوی کاربەدەستان، لە وەزیری نەزانی یەکەوە بگرە تا دەگاتە وەزیری نەزانی ٥٢. لە بەڕێوەبەرە گشتییەکانەوە بگرە تا دەگاتە ئەندام پەرلەمانە خەواڵووەکان، تا دەگاتە

**کاربەدەستەیلی باڵای پۆلیس، ئاسایش، پاراستن، تا دەگاتە سەرۆکی ناوچەکان و پلە حزبی و حکومییەکان.**

## ٥

هەر هەموویان ئەو شەوە سەرخۆش بوون و دەڕشانەوە. تەنیا دووی سوور و چەند کاربەدەستێکی تری زۆر باڵا نەبێ، ئەوی تر هەمووی لەسەر شەقام کەوتبوو. جگە لە پەیکەری سەرخۆشی، هەندێ جار وێنەکە بە پەیکەری نابەرپرسیارەتی دەچوو، ئەوەی ئەو شەوە ئەوانی بینی با، هەرگیز جارێکی تر بەڕۆژ باوەڕی بەوان نەدەکرد لەسەر شاشەکانی وڵاتی شازلاند. هەر ئەو سەرخۆشانە بوون، بەڕۆژ بەردەوام وتاریان دەڕێسی لەسەر شاشەکان.

پەیکەری جووڵە و پەیکەرم خەم گەیشتنە کۆمەڵێك کاربەدەستی سەرخۆش، لە باخچەیەکی نزیکی هوتێلی فیرعەونەکان دانیشت بوون. کەمێك بەدیاریانەوە وەستان. سەرخۆشەکان قسەیان دەکرد و ئاگایان لە حەشتەبای دنیا نەبوو، تەنانەت ئەو دوو پەیکەرەش کە لە دووری ١٢ مەترێك وەستا بوون. زۆر خراپ باسی حزبەکانی خۆیان دەکرد. حزبەکانی خۆیانیان بە خەزێنەی پارە و کەر دەزانی.

ئەوجا باسی موراجیعەکانی رۆژانە، ئەو هاوڵاتییە قوڕبەسەرانە بوون کە جاری وا هەیە بۆ ئیمزایەك یەك مانگ یاریی بە کەرامەت و

ئەقڵ و کاتیان دەکرێ. دواتر باسی ئافرەتیان کرد. بەناشرینتین و نامرۆڤانەترین شێوە باسی ئافرەتیان کرد. پێیان وابوو ئافرەت ئامێرێکی رەحەتبوونە، وا لە ئافرەت تێگەیشتبوون کە تەنیا لەسەرجێ قسەی لەگەڵدا بکرێ، کاتەکانی تر تەنیا خزمەت بکا و لێی بدرێ!

هەر ئەو بیر بۆگەن و کەللە پوچانەش بوون بەڕۆژ لەسەر شاشە باسی مافی ئافرەت و ئازادیی ئافرەتیان دەکرد. دواتر هاتنە سەر باسی کۆمپانیاکانیان، ئەوجار بڕیارییان لەسەر ئایندەی وڵات دەدا. بڕیار چ بڕیار: سەیرترین، نابەجێترین و نابەرپرسیارانەترین بڕیار لەبارەی هەموو شتێکی ئەم وڵاتە لای ئەو سەرخۆشانە دەردەچوو.

دوای بیستنی هەموو ئەو بابەتانە، هەردوو پەیکەر تەماشایەکی یەکتریان کرد و هەناسەیەکی قووڵ و ساردیان هەڵمژی. سەریان بادا و وردە وردە رۆیشتن.

٦

بەدەم ڕۆیشتنەوە، پەیکەری جوولە لە پەیکەری خەمی پرسی، "مامە خەمە، بۆچی وات پێ دەڵێن؟" تەماشایەکی کرد و بەردەوام بوو "پێ دەچێ مێژوویێکی تژی لە کەسەرت هەبێ، مەگەر وانییە؟"

پەیکەری خەم زەردەخەنەیەکی هاتێ و پیشێکی قووڵی خواردەوە. لە پشییەکەڕا دیار بوو کە باشترین و لەجێترین پرسیاری لێ کراوە. زۆری پێ خۆش بوو وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، وەك بڵێی دەمێکە چاوەڕێی کرد بێ. بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی پەیکەری جوولەی دایەوە:

*"من لە بەندەن هاوشانی شاخبڕ، کاك روکن و کاسپەر و برادەرانی تر خزمەتی دووی سوور و ئەوانەی هاوشێوەی ئەو بوون لە دەسەڵاتدا، دەکرد. من لەوێش تا سەر ئێسك خەمم لە سیاسەت و هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەیان دەخوارد. نادادوەری، کەللەپوچی و بێسەربەری ئەوانە لە هەموو شتێك زادە و هەوێنی سەردەمی شاخە."*

پەیکەری خەم لەو قسانەدا بوو، یەکێك لە سەرخۆشەکان یەك بەدەنگی خۆی هاواری کرد:

***شەریفە باوکەڕ،***

***هەی داد هەی بێ داد***

***لەو حزبەی ئێمە***

***چەندە فشۆڵە... چەندە گەندەیە***

***ئاییە، ئۆییە***

***ئەم وڵاتەی ئێمە درۆیە***

هەردوو پەیکەر تەماشای یەکتریان کرد و دواتر پێکەنین. دواتر پەیکەری خەم درێژەی بەقسەکانی دا.

٧

"شاخبڕ، پاڵەوان بوو، کەچی ئێستە بووەتە کۆیلەی پارە و مەنسەب. کاسپەر قارەمان بوو لە شاخ، کەچی ئێستە بووەتە گەورەترین درۆزن لەم وڵاتەدا. ئەی ئەمانە خەم نین؟ من ناتوانم گێل بژیم و ئەو کێماسییە گەورانە لە وڵاتەکەم نەبینم، ئەو وڵاتەی لە پێناویدا تەواوی تەمەنی گەنجیم کردە قوربانی لە شاخ و بەردەوام سینگم دەدا بەر گوللەی دوژمن. ئەوەی دووی سوور و ئەو قارەمانانە باسیان لێوە دەکرد وێنەیەکی تر بوو، وڵاتێکی تر بوو، وڵاتێکی مۆدێرن و پێشکەوتوو. کەچی ئەم شازلاندەی ئێستە بەهیچ کلۆجێك بە خەیاڵیش نزیك نییە لە قسەکانی ئەوان. وەك بڵێی بە دوو چرکە پێش ئەوەی لە شاخ بێنە خوارەوە، بەئامێرێکی زۆر پێشکەوتوو تەواوی سیستمی مێشك و دەمارەکانیان فۆرمات کرا بێ."

"بەڕاستی تۆ پەیکەرێکی لە خەم. باشە دوای هاتنەخوارەوە لە شاخ و لەناوبردنی دیکتاتۆر، تۆ چیت کرد، مەنسەبێك، کارێك . .

." پەیکەری جوولە بە پەرۆشەوە قسەکانی بە پەیکەری خەم بڕی و لێی پرسی.

پەیکەری خەم سەرێکی بادا و ئاهێکی پڕ لە حەسرەتی هەڵکێشا و بەردەوام بوو:

"من یەکێك بووم لەوانەی بەڵێنم دابوو دوای تەواوبوونی سەردەمی شاخ، دانیشم و ڕێ بۆ گەنجانی وڵاتەکەم بکەمەوە تا وڵاتێکی ڕێك دروست بکەن. چونکە ئێمە، زۆربەمان لە شاخ هیچ بڕوانامەیەکمان نییە، کۆلەوارین، بەڵام پیاوی قارەمان و ئازا بووین و مەرگمان بەپێشە خۆمان دا. تەنیا من بەڵێنەکەم هێنا جێ، هەرکە شۆڕشەکەمان بەسەرکەوتوویی تەواو بوو، من دانیشتم، بەڵام ئەوانی تر، هەر هەموویان، وەك دز و جەردە کەوتنە گیانی ئەم وڵاتە، تا ئێستەشی لەگەڵ دابێ دروستیان نەکرد."

## ١

له ٢٠١٤/٢/٢٢دا، لەسەر سنوورگەلی ولاتی شازلاند بە سەتان بیانی ریزی بەست بوو تا نۆرەیان بێ، مۆری چوونەژوورەوەیان بۆ لێ بدرێ و پێ بنێنە ناو خاکی نەزانان. بیانییەکان لە ولاتی جۆراوجۆرەوە هاتبوون: ولاتە یەکگرتووەکانی شاتوو ، ولاتی زەوق و شەوق، ولاتی بەربەرستان، ولاتی تایەی رەش، ولاتی شەمولان، ولاتی چاو سووران و چەندان ولاتی تری دنیا. ئەوەی لەسەر سنوورگەلی وەك بەزم، ساخکردنەوە، سنووری خیت، سنووری کێ بەکێ، سنووری لینگەوقووچ و سنووری شاروخ ریزی بەستبوو، هیچیان بە وەستا، لێزان و کارزان نەدەچوو. وێدەچوو هەرچی چەرچی و پەرچی، فاشل، دۆڕاو، ناکەسبەچە و ناپیاوی دنیا هەیە بانگهێشت کرا بێ بۆ ولاتی شازلاند. پێستی بیانییەکان لەبەر تیریژی بەتێنی سەرسنوورەکان دەبرژا، بەلام بەرگەی هەموو شتێکیان دەگرت چونکە ئەوەی مۆری بۆ لێدرابا و بپەڕیباوە، ئەوا پارووی دەکەوتە ناو روونی.

کارمەندانی بازگە و دەروازەی سنوورەیلی شازلاند هێندە رێزیان لە بیانییە پێست برژاوەکان دەگرت هێندە رێزیان لە دایك و باوك و

تەنانەت سەرۆکەکەشیان نەدەگرت. فەرمانگەی خزمەتکردنی بیانییەکان لە وڵاتی شازلاند ٢٢٢ کەسی پرۆفێشناڵی نارد بوو بۆ پێشوازیکرن لە بیانییەکان. پرۆفێشناڵ نا لە بەڕێوەبردن و دروستکردنی وڵات یاخود لە کاروباری دەرەوە و دیبلۆماسییەت و تۆکەمکردنی پێوەندییەکانی دەرەوە، بگرە پرۆفێشناڵ لە برۆکردن، قژ رەشکردنەوە، لەبەرکردنی باشترین قات و ریبات، لە پێڵاوی لموز باریك، لە کڕنووشبردن بۆ بەڕێوەبەر و گەڵ، پرۆفێشناڵ لە هەموو ئەو شتانەی کە ئابڕووی وڵاتیان پێ دەچێ لەلای بیانییێکی بێ ئەمەکی نەزان.

٢

پەیکەری گومان شاندێکی لێزان و شارەزای نارد بوو بۆ هێنانی میوانە بیانییەکان بەسەلامەتی و دابەشکردنیان بەسەر هەرسێ شارەکەدا: شاری زیندووان، مەستی و مەنگ. شاندەکە لە هەموو شتێك لێزان و شارەزا بوون تەنێ لە کارەکەیان نەبێ کە مانگانە باشترین مووچەی پێ وەردەگرن، باشترین ئیمتیازات و ئەولاو ئەملایایان بۆ سەرف دەکرێ. لێزان و شارەزا لە کوشتن بەنامەردی، لێزان و شارەزا لە زمانلێدان و گرتن، لە ئەشکەنجەدانی جەستەیی، روحی و دەروونی، لێزان و شارەزا لە گەڵ، لە چەپەڵی و چڵێسی، لێزان و شارەزا لە گومان و دروستکردنی سیناریۆی قێزەوەن بۆ ناشرینکردن و لێدان و لەکەدارکردنی خەڵکی پاك و دڵسۆز.

ئەو پێشوازی و مەراییەی سەر سنوورەکانی بەزم، ساخکردنەوە، سنووری خیت، سنووری کێ بەکێ، سنووری لینگەوقووچ و سنووری شاروخ راستەوخۆ پەخش دەکرا لەسەر تەواوی شاشەکانی هەرسێ شاری شازلاند، بێگومان بە شارۆچکە و لادێ و قەزاکانیشەوە.

هەرچەندە ئێستە خەڵکی زۆر لەبارەی دووی سووریان دەزانی، چاویان کرا بووەوە لە سیستمی بۆگەنی وڵات، وەك جاران بایەخیان بە پەخشی شاشەکان نەدەدا، کەچی هێشتا خەڵکێکی زۆر هەبوون بەپەرۆشەوە سەیریان دەکرد و گوێیان بۆی شل دەکرد.

## ٣

پەیکەری جوولە و پەیکەری خۆشەویستی لەسەر قەڵای شاری زیندووان دانیشتبوون. شاشەیەکی گەورە بەرامبەریان بوو. کاتێ پەیکەری جوولە ئەمەی بینی، پێکەنی و رووی لە پەیکەری خۆشەویستی کرد و گوتی: "دەزانی ئەم بیانییانە بۆچی لەوێ ئاوا قەتارەیان بەستووە؟"

"دیارە لە وڵاتی خۆیان ئیش نییە، رەنگە بۆ ئیش هاتبن،" پەیکەری خۆشەویستی بەدەنگێکی هێمن وای گوت.

"قسەکەت راستە! دەتوانم هەمان قسەی تۆ بەشێوەیەکی تر دەربڕم،" پەیکەری جوولە نیگایەکی رژدی گرتە پەیکەری خۆشەویستی و بەردەوام بوو، "ئەوانە هەر هەموویان لە وڵاتی خۆیان فاشلن و ئیشیان دەست ناکەوێ. ئەگەر ئیشیان دەستکەوتبا لێرە پێستیان لەبەر ئەو گەرمایە نەدەسووتا. دێن لێرە خۆیان دەکەن بە زانا و زانست و مەعریفەتمان پێ دەفرۆشن، گوایە بە ئەزموون و لێهاتوون."

"جا وایە؟" پەیکەری خۆشەویستی پرسیاری کرد.

"نەخێر. خەڵکی ئەم شازلاندە، بە رەشە و گەشەیەوە، حاکم و میر، هەژار و دەوڵەمەندییەوە، لەوەتەی هەیە هەر بێگانە پەرست بووە. دەزانی فاشلی هەموو دنیا بەم خاکە دەژی، کەچی خەڵکی خاکەکە خۆی خەریکە بمرن لە برسان."

"کا خەڵك دەمرن لە برسان، باوەڕت هەبێ لە هیچ سەردەمێك خەڵکی هێندە تێر نان نەبووە."

"راست دەکەی، خەڵك تێر نانە، ئۆتۆمبیلی هەیە، کاری هەیە، پارەی دەستدەکەوێ، بەڵام برسی دادوەری، ئازادی بیرکردنەوە و رادەربڕینە، برسی یەکسانی و پاکی و دڵسۆزییە. برسی وڵاتێکە تا شانازی پێوە بکە. دەزانی ئەم خەڵکەی ئێمە شانازی بەوڵاتی خۆیەوە ناکا. ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورەیە. کارەساتە خەڵك ئینتیما و خۆشەویستی بۆ وڵات نەبێ یان نەمێنێ."

"باشە، ئێستە ئەو بیانیانەی وا لەسەر سنوور ریزیان بەستووە، چی دەکەن لێرە، مەبەستم ئەوەیە چ جۆرە کارێك دەکەن؟"

پەیکەری خۆشەویستی، ئاخێکی هەڵکێشا و پرسی.

"ئەوانە زانان دێن نەزانان فێر دەکەن. ئەی بیرت نایەت، هەفتەی رابردوو، دووی سوور رایگەیاند وڵاتەکەی پێویستی بەئەزموونی وڵاتانی ترە؟"

"کا، کەی وای گوتووە؟"

"چۆن ئەمەت نەبیست؟ لەسەر هەموو شاشەکان ماوەی چەند ڕۆژێك ڕاگەیاندنەکە هەر بەردەوام بوو."

"باوەڕت هەبێ لەبەر دووی سوور و دارودەستەکەی ماوەییێکە سەیری شاشەکان ناکەم."

"هەر تۆ نیت، خەڵکێکی زۆر وازیان لە گوێگرتن و سەیرکردنی درۆی مرۆیە ناشرینەکانی سەر شاشەکان هێناوە،"

پەیکەری جووڵە بە دڵخۆشییەوە وای گوت و دواتر لەسەر شارەزا و لێزانەکان بەردەوام بوو، "ئەوجا با ئەوەشت پێ بڵێم ئەوانەی دێن باشترین مووچەیان پێ دەدرێ. کەمترین مووچە، واتە نزمترین کار، هەشت هەزار دۆلار دەبێ. خۆشترین خانوویان لە خۆشترین و ئارامترین گەڕەك بۆ دێتە بەکرێگرتن. ساڵانە دوو جار پلیتی باڵەفڕگەی چوون و هاتنیان لەسەر حکوومەتە. بێ لە مووچەی مانگانەش، هەریەکە ٥٠٠ دۆلاری تریان پێ دەدرێ بۆ خەرجی ڕۆژانەیان. من هەر ئەوەندە دەزانم، داخوا چی تریان بۆ خەرج دەکرێ."

## ٤

تا نیوەڕۆ، هەر هەموو بیانییەکان مۆری هاتنەژوورەوەیان بۆ لێ درا. تەنیا لەو ڕۆژەدا، ژمارەیان گەیشتە ١٢٢٢ کەس، هەر یەکە لە بواری خۆی. بواری جۆرەوجۆرییان تێدا بوو: مامۆستای ئینگلیزی، ئای تی، راوێژکاری پەروەردەیی، راوێژکاری سیاسی، راوێژکاری ئابووری، راوێژکاری نەوت و غاز، راوێژکاری ئاوەدانکردنەوە و بازرگانی، پسپۆڕی بەڕێوەبردن و تا دوایی.

دووی سوور بڕیاری دا ئەوەی لە پلەی بەڕێوەبەرییە لە وڵات دەبێ بیانییێکی لەگەڵدا بێ. لە بەڕێوەبەری شۆفێرانەوە بگرە تا دەگاتە وەزیر و تەنانەت سەروەزیرانیش، تەنانەت دووی سوور خۆیشی بێگانەیەکی بەناو شارەزایان لەگەڵ دانا. جا هەر بەڕێوەبەرە و بەپێی پلەی خۆی، هەبوو یەك راوێژکاری بیانی هەبوو، هەشبوو دەیان راوێژکاری هەبوو.

ئەمە بڕیارێکی زۆر باش بوو بۆ یارمەتیدانی نەزانەکان تا بتوانن فێر بن و وڵات دروست بکەن. چونکە لە شازلاند کەسی شیاو هەرگیز ناچێتە شوێنی شیاو. کاتی خۆی لە شاخ سوێندیان خوارد و بڕیاریان دا ئەگەر بۆیان لوا کیانێکیان هەبێ ئەوا دوای

**تێکشکاندنی لایەنی دەروونی و شکۆی تاك، ئەوجا هیچ کەسێکی شیاو لە شوێنی شیاو دانەنێن، بۆ ئەوەی بەردەوام خەڵك چاوی لەدەستی ئەوان بێ.**

## ٥

لە دوورەوە سەیری شازلاند بکەی، تژییە لە نەزان، پەیکەرێکە لە نەزانی. هەق وایە داوا لە گەورەترین پەیکەرتاشی دنیا بکرێ، پەیکەرێك دروست بکا تەعبیر لە نەزانی بکا. دواتر لە هەر فەرمانگەیەك، لە تەنیشت بەڕێوەبەر، وەزیر، سەرکار، پەیکەرێکی نەزانی دابنرێ.

بیانییەکان لەوپەڕی خۆشیدا دەژین لە شازلاند. لە نێوان خۆیاندا، کە جارجار کۆ دەبنەوە، گاڵتە بە سەرانی شازلاند دە کەن و بەچاوێکی سووك تەماشایان لێیان رادەمێنن. یەکێکیان راوێژکاری رێکخستنی درۆ بوو بۆ سەروەزیرانی شازلاند. یەکێکی قەڵەو، ئەسلەح، سوور و سپی بوو، چارشانە، ناوقەد ئەستووری لینگ باریك، خەڵکی وڵاتە یەکگرتووەکانی شاتوو بوو. لە وڵاتی خۆی لەسەر شەقام شەندەری دەفرۆشت، بەڵام لە شازلاند بووەتە پیاو. لە دوورەوە بە پەیکەری کلاوات دەچوو. دوور مەبینە، درۆیەکانی سەر شاشەگەلی شازلاند لەمەوبەر تۆزێك بەدرۆیان بچن و کلك و گوێیان هەبێ. پێشتر راوێژکار و پسپۆڕیان نەبوو درۆکانیان بۆ رێك بخا، بۆیە منداڵێکی دێوەرەش دەیتوانی بڵێ

ئەمانە درۆن. بەڵام لەبەرئەوەی خەڵکەکە تووشی تیرۆری دەماغ بووە، هەرچی بگوترێ وەریدەگرن و باوەڕی پێ دەکەن. لەمڕۆ بەدواوە شازلاند پێویستی بەشۆردنەوەی مێشك نییە، بگرە ئەوەتا شارەزایان هێناوە بۆ ڕێکخستنی درۆکانیان.

"ئەگەر ئەوانە سووك نەبوونایە ئەوا دەچوون لەباتی ئێمە، زانا، شارەزا و پسپۆڕانی خۆیان لە دەرەوە دەهێنایەوە،" پەیکەری کلاوات وای بە خەڵکەکەی چواردەوری گوت.

"ڕاست دەکەی، دەزانی خەڵکی زۆر زیرەك و زانایان هەیە لە دەرەوە، تەنانەت لە ناوەوەش،" یەکێك لە بیانییەکان وای گوت، دواتر دای لە قاقای پێکەنین و بەردەوام بوو، "کاکە دە لێ گەڕێ وا بۆ خۆمان لێی دەخۆین، جا چ پەیوەندیمان بەوانی ترەوە هەیە."

"گەر ئاوت لە کانییێك خواردەوە بەردی تێمەگرە،" یەکێکی تر لەسەرخۆ وای گوت.

## ١

له ٢٠٠٨/٢/٢٢دا، یەكێ لە دەستوپێوەندەكانی سەرۆكی دووەمی دەستەی گومان لە شاری مەستی بەپەلە خۆی گەیاندە ئۆفیسی سەرۆكەكەی. ئەم سەرۆكە جێگری پەیكەری گومانە لە شاری مەستی.

سەرۆكی دووەم پیاوێكی كەللە زلە، هەموو سێ مانگ جارێك قژی بەشیر دەشوا و دواتر دەیتراشێ. زۆر هۆگری دایكیەتی، بۆیە بێ ئەو هیچی پێ ناكرێ. هەندێ جار شەپقەیەكی سپی لەسەر دەكا، بەتایبەتی ئەو دەمانەی دەچێتە ناو خەڵك. پیاوێكە زۆر خەرج دەكا. دەڵێن یەك بتڵی بچووكی شەرابی نایاب بە حەفت هەزار دۆلار دەكڕێ كە بای دوو پێك ناكا. تەواوی شاری مەستی كۆنترۆڵ كردووە.

پێش ئەنجامدانی هەر كارێك پرس بە دایكی دەكا. دایكی قژ ماش، تەبەش پان، باریك و بەژن مامناوەند. پێوەندیی نێوان ئەم دایك و كوڕە زۆر پتەوتر بوو دوای ئەوەی مردنی گەورەی ماڵیان، باوكی كوڕەكە، بۆ ماوەی سێ مانگ بە نهێنی هێشتەوە. باوكی وەستایەكی باشی پێكهێنان و بەڕێكردن بوو لە ناو سیاسەت. ئەم

دایك و كوڕە نەك هەر مەستی بگرە شاری زیندووانیشیان كۆنترۆڵ کرد بوو. بۆیە هەواڵی ئەوێشیان لە رێی خەڵكی تایبەتی خۆیان پێ دەگەیشت.

## ٢

کاتێ خزمەتکارەکە گەیشتە بەردەمی ئۆفیسی سەرۆکی دووەم هەموو گیانی ئاو بوو. هێندە بەپەلە هات بوو وەك بڵێی فەرمانی پاشایەکی زۆردار رێك لە ساتی خۆیدا جێبەجێ بکا. ترس هەموو گیانی داگیر کرد بوو. لە دوورەوە بە پەیکەری ترس دەچوو. پێش ئەوەی لە دەرگا بدە، دەموچاوی کەمێك وشك کردەوە، خۆی رێکخستەوە، یەك دوو هەناسەی قووڵی دا و پیشێکی باشی خواردەوە. ویستی بچێتە ژوورەوە، بە ئاستەم گوێی لە ئاه و مرچە مرچ و شەپە شەپ بوو. یەکەم جار باوەڕی بە گوێچکەکانی نەکرد، بەڵام تۆزێکی تر لە دەرگای ئۆفیسەکە نزیك بووەوە و بە ئاستەم گوێی راستی بە دەرگا سەوزەکە نا.

دەنگی ئاخ و ئۆف، هەناسەبڕکێ و مەستی بوو. وەك بڵێی دەنگی رامووسانی شیرین و فەرهاد بێ کە بۆ یەکەم جار پێکگەیشتبن. بەڵام یەکێك بەوێدا تێپەڕی و ئەویش خۆی لە خەت دا. تا سەری کەسەکە ئاوا بوو، ئەویش دەنگەکانی بیر چووەوە. بۆیە دەستێکی بەقژیدا هێنا و دەرگاکەی ڤەکرد. قاچی راستی خستە ناو ژوورەکە و سەری بەرزکردەوە، حەپەسا، تاسا، رەنگی

تێکچوو، دەمی تەتەڵەی کرد، چاوی خێل بوو، ئارەقی رەش و شینی کرد. باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد.

## ٣

ئەوەی پەیکەری ترس بینی دیمەنێك بوو کەسێکی وەکو سەرۆکی دووەم نابێ تێیدا ئەکتەری سەرەکی بێ. پەیکەری ترس ئەمەی بینی: کچێکی ناسك و باریك، سمت خڕپن، دەموچاو وردیلە لە سەرۆکی دووەم ئالاّ بوو. وەك ئەوەی دوو مار ببینی بەڕووتی تێك ئالێن! دیمەنەکە لە دوورەوە بە پەیکەری ئیرۆتیك دەچوو، لە نزیکەوە بە پەیکەری سێکس دەچوو. لەبەر هانکەهانك و راموسانی یەکتر ئاگایان لە پەیکەری ترس نەما بوو. ئەویش لە ترسان و لە تاسان دەم و ئەژنۆی شکا. وەك منداڵێك کاتێ لەبەر تاییێکی بەتێن فێ دەگرێ و شاگەشکە دەبێ و دەکەوێتە سەر زەوی، ئەویش بەم کلۆجە کەوتە سەر زەوی و تەپەی لێوە هات.

سەرۆکی دووەم، رووخساری لەم ساتەدا بەپەیکەری شەرمەزاری دەچوو، خێرا کچەکەی لەسەر مێزەکەی هێنا خوارەوە و بەپەلە جلەکانیان لەبەر کرد و کچەکەی بەڕێ کرد. زەنگێکی لێ دا، کۆمەڵێك کەس هاتن و دەستە و ئەژنۆ گوتیان: "بەلێ گەورەم، فەرمانمان پێ بکە." بە دەست ئاماژەیەکی بۆ پەیکەری ترس کرد چونکە لەو ساتەدا جەڵتە لە دەمی دا بوو و قسەی بۆ نەدەکرا.

## ٤

پەیکەری ترسیان بردە دەرەوە، دوای چارەسەر و هەندێ ئاوپێداکردن هاتەوە ئاوەز خۆی. کە چاوی هەڵێنا پەیکەری شەرمەزاری لەسەر سەری وەستا بوو. بەم دیمەنە زیاتر شڵەژا و ترسا. پەیکەری شەرمەزاری یەکسەر لێی پرسی: "کە هاتیتە ژوورەکەم، چیت بینی؟"

"هیچ،" پەیکەری ترس بەدەنگێکی تژی لە ترس وەڵامی دایەوە و پاشان بەدەنگێکی نیوچە پچڕاو بەردەوام بوو: "چ ببینم گەورەم، هەرکە دەرگام کردەوە یەکسەر کەوتم، دواتر نازانم چی رووی دا."

"بەڵێ کە هاتیتە ژوورەوە هیچت نەبینی. باشە، ئەی بۆ کەوتیت؟"

"قوربان پێشی بێمە ژوورەوە دوو سێ جار لە دەرگەم دا. پاشان سەرم سوڕا و دەرگاکەم کردەوە و یەکسەر کەوتم."

"باشە بۆچی ویستت بمبینی، هیچ هەواڵێکی گرینگ هەبوو؟"

"بەڵێ، کاسێتێکم بۆ هێنا بووی کە دەنگی پەیکەری ئیمانی تێدا تۆمار کراوە."

"چی گوتووە؟"

"نازانم گەورەم، کاسێتەکە لەناو گیرفانی چاکەتەکەمە وا بە هەلاقەکە کراوە، تکایە بیبە و بۆ خۆت گوێی لێ راگرە. من نازانم باسی چی دەکا."

٥

پەیکەری شەرمەزاری باوەڕی بە پەیکەری ترس نەبوو هیچی نەبینی بێ. ویستی هەر لەسەر جێگەکەی لە ژووری پزیشکی تایبەتی خۆی بە یەك دوو کەللە تەواوی بکا. ویستی بەرۆکی بگرێ و بیخنکێنێ. بە یەك چرکە هەزار سیناریۆی کوشتنی پەیکەری ترسی بەمێشکدا هات. بۆیە زۆرجار بە پەیکەری شەرمەزاری، یان سەرۆکی دووەمیان دەگوت پەیکەری سیناریۆی کوشتن. بەڵام وازی لێ هێنا و چوو کاسێتەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بەپەلە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی.

وێنەی باوکی بەگەورەیی لە پشت سەرییەوە هەڵواسرا بوو. حەوزێکی ماسی لە بەرامبەر مێزەکەی هەبوو کە چەندان ماسی جۆرەوجۆری تێدا بوو. بەتەماشاکردنی ماسییەکان مرۆ دڵی ئارام دەبوو. بە زێڕ بنمیچی ژوورەکەی نەخشێنرا بوو، دیوارەکانی ئاسن بوون، بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانە دەرگا ئاسنینەکەی دا بخا و کەس نەتوانێ زەفەری پێ ببات. لەسەر کورسییەکەی دانیشت و پیشێکی قووڵی خواردەوە. کەمێك بیری لە پەیکەری ترس

کردەوە: "دەبێ بینیبێتی؟" دواتر خێرا دەستی دایە تەلەفۆنی ژوورەکەی و قسەی لەگەڵ دایکی کرد.

"بەیانی باش دایکە."

"باشتر کوڕەکەم."

"دایکە، دەتوانی تا ژوورەکەی من بێیت."

"هەر ئێستە؟"

"بەڵێ.

"بۆ شتێك بووە؟"

"بەڵێ، سەرە داوێکم لەبارەی پەیکەری ئیمانەوە دەستکەوتووە."

"باشە هەر ئێستە دێم."

تەلەفۆنەکەی بەتووندی داخستەوە و خێرا کاسێتەکەی بەئامێری دیجیتاڵ کردە سی دی و خستییە سەر دیڤی دییەکە و ئامادەی کرد تا دایکی گەیشت. تا دایکی هات، پەیکەری شەرمەزاری بیری هەر لای پەیکەری ترس بوو.

## ٦

قسەکانی پەیکەری ئیمانی باراندیتە بەم شێوەیە بوون:

***"ئاین لە کۆمەڵگەی دوا کەوتوودا بە کۆمەڵێك تەلبەند دەورە دراوە. با کۆمەڵگەی شازلاند بەنموونە وەرگرین. سەیرکەن، ئاین لەم وڵاتەدا بووەتە داوونەریت. داوونەریتی مردوو، نابەجێ و ناشرین پەیڕەو دەکرێ، دەڵێن ئەمە ئایینە. لەبەرئەوەی ئایین بووەتە داوونەریت، منداڵەکانمان، هەر لە سەرەتای تەمەنییانەوە، فێری ئەو داوونەریتانە دەبن و لەسەری رادێن. جا مەرج نییە باوەڕیان پێی پتەو یان شلۆق بێ. ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی ئایین دەزانن لەم وڵاتەدا، هەر لە کۆنەوە، بەم شێوەیە ئاینیان داهێناوە بە مەبەستی درێژەدان بەجڵەوی دەسەڵات و گێلکردنی خەڵك."***

پەیکەری شەرمەزاری و دایکی تەماشایەکی یەکتریان کرد و برۆی سەرسڕمانیان لە یەکتر بڵند کرد. دواتر بەردەوام بوون لە گوێگرتن. پەیکەری ئیمان وتارەکەی تا کۆتایی لەسەر ئیمان بوو.

چەندان حەدیسی هێنایەوە کە پێناسەی ئیمانیان دەکرد، چەندان نموونەی ئیمانی باس کرد. دەیگوت پێغەمبەری خوا (د.خ.) فەرموویەتی ئیماندار ئەو کەسەیە خەڵکی لە زبان و دەست و داوێنی هەست بەسەلامەتی بکەن. جا لەسەر ئەم قسەیە نموونەی ئەم سەردەمەی باس دەکرد و دەیگوت:

*"بیر بکەنەوە، کامەتان ئێستە لەم ئۆفیسەدا هەست بەسەلامەتی دەم و دەست و داوێنی بەڕێوەبەرەکەی دەکا. یان کامەتان دەوێرن قسەیەك لەبارەی درۆکان، کار و داوێنپیسییەکانی بەڕێوەبەر بکەن. منداڵێکی سەر شەقام دەزانێ کە چی دەکا و چی ناکا."*

٧

پەیکەری شەرمەزاری و دایکی تا کۆتاییی گوێیان گرت، وەك بڵێی هەردووکیان لە ناو مزگەوت دانیشتبن و گوێ لە وتاری هەینی بگرن. کە قسەکانی پەیکەری ئیمان تەواو بوو، بۆ ماوەیەك هەردووکیان تاسان. پاشان دایکی تەلبەندی بێ دەنگی شکاند و پرسی، "باشە ئەم پیاوە کێیە و لە کوێ کار دەکا؟"

پەیکەری شەرمەزاری هەستا سەر پێ و تا بەر دەرگاکە ڕۆیشت، پاشان رووی وەرگێڕا و گوتی، "دەڵێن، بەڕێوەبەری ژمێریارییە لە وەزارەتی نەزانی ژمارە ٤. لەبەر دینداررییەکەی پێی دەڵێن پەیکەری ئیمان. هەر بەو ناوەش ناسراوە و بانگ دەکرێ."

"باشە، ئەم کابرایە بۆچی هەڕەشەیە؟"

"چۆن هەڕەشە نییە دایکە، تازە قسەکانت نەبیست."

"کێ دەنگی تۆمار کردووە؟"

"یەکێ لە پیاوەکانم چووەتە لای و چەند پرسیارێکی ئاینی لێ کردووە، دواتر بەگلەییکردن لە بەڕێوەبەری گشتی و وەزیری نەزانی ٤، ئەویش ئەمانەی گوتووە کە تازە بیستت."

## ٨

دواتر پەیکەری شەرمەزاری و دایکی بەردەوام بوون لە تاوتوێکردنی پەیکەری ئیمان وەك هەڕەشەیەکی گەورە بۆ سەر تەناهی نیشتمانی. پێیان وابوو ئەو پەیکەرە رۆژێك دێ وڵات دەڕووخێنێت.

پەیکەری شەرمەزاری زەنگێکی لێ دا، کۆمەڵێك کەس هاتن، فەرمانی پێکردن کە فایل و داتا و کونیەی پەیکەری ئیمانی هەر ئێستە بۆ بێنن.

فایل و داتاکانی پەیکەری ئیمان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

ناو: پەیکەری ئیمان

شوێنی دانیشتن: شاری زیندووان

شوێنی کارکردنی: وەزارەتی نەزانی ژمارە ٤

پلە: بەڕێوەبەری ژمێریاری.

ئینتیمای نیشتمانی: زۆر پتەو و پاك

ئینتیمای حزبی: بێ لایەن

رقی لە کێ دەبێتەوە: کەس، هەموو کەس خۆشیان دەوێ و زۆر رووخۆش و پاکە

ئینتیمای بۆ حزی ئیسلامی: نییەتی و حزبە ئیسلامییەکان خۆیان بۆیان ڕێك بکەوێ دەیکوژن

باری دارایی: ژیانێکی زۆر سادە و ساکاری هەیە. دەوڵەمەند نییە.

ئاستی دزینی: پاکە و تا ئێستە سەنتێك چییە نەیدزیوە.

خزمەتی: ئەوە ٢٢ ساڵە خزمەت دەکا

هەڕەشەیە؟: بە هەڕەشە دادەنرێ لە ناو وەزارەت چونکە زۆر پاك و بێگەردە. وەزیر و دەستوپێوەندی هەموو هەوڵێك دەخەنە گەڕ تا وەك خۆیانی لێ بکەن، بەڵام ئیمانی زۆر بەهێزە و هیچ شتێك کاری تێ ناکا.

# ١

٢٢ ڕێ هەیە لە شازلاند بۆ شاری مەستی. هەر ٢٢ ڕێ لە ٢٠١٦/٢/٢٢دا بە بەرناکەون. تەواوی خەڵکی شاری مەنگ و شاری زیندووان و دەوروبەرەکەیان لەو ڕۆژەدا دەچن بۆ شاری مەستی. ڕێیەکان هێندە قەرەباڵغ دەبن ئۆتۆمبیل ناتوانێ ڕێ بکات. لە ڕۆژێکی ئاساییدا، لە زیندووانەوە بە دوو سەعات و نیو دەگەیتە مەستی، بەڵام لە ڕۆژێکی وەهاداماڵباتی وا هەبووە لەگەڵ قووقەی کەڵەشێر بەڕێکەوتووە تا ئێوارە هەر نەشگەیشتووەتێ. هەرچی ئۆتۆمبیل هەبوو لەم وڵاتەدا لە یەکێ لە ڕێیەکانی شاری مەستی گیری خوارد بوو. بۆیە چڕە دووکەڵێکی ڕەش سەراپای وڵاتی شازلاندی تەنی بوو. لە دوورەوە وڵاتەکە بە پەیکەری دووکەڵ دەچوو. دووکەڵ هێندە زۆر بوو هەرچی ژن و پیا و منداڵ و پیر هەیە دەموچاوی ڕەش داگەڕا بوو.

گیرانی ڕێیەکان وای لە خەڵك کرد ئۆتۆمبیل بەجێ بێڵن و بەپێ بەرەو شاری مەستی ڕێ بکەن. وەك بڵێی وادەی حەجە و هەر دەبێ لە کاتی خۆیان بگەن. سێ ملیۆن سەر بەرەو مەستی ڕژابوونە سەر هەر ٢٢ ڕێ. وەك گاڕانی مەڕ سەریان لە دوو یەك نا

بوو، ملیان شۆڕ کردبووەوە و پێنگاویان دەنا. لەگەڵ ئەو ڕۆژی حەشرەشدا، خەڵکەکە هەمووی زەردەخەنەیەکی لەسەر ڕوو بوو، وەك بڵێی لە ڕۆژی حەشر مژدەی بەهەشتیان پێ درا بێ و بەرەو ئەوێ دەچن، جا ڕێیەکە هەرچەند دوور و ناخۆش بێ قەیناکە.

## ٢

ئەم کۆڕەوە ڕاستەوخۆ لەسەر شاشەکانی شازلاند و دنیاش دەهاتە وەشاندن.

پەیکەری جووڵە و پەیکەری خەم ئەم کۆڕەوەیان لەسەر شاشە بینی کاتێ لە کونجێکی شاری زیندوواندا خەریکی تاتوێکردنی چەند پلانێکی نوێ بوون بۆ بڵاوکردنەوەی ناوی دووی سوور بە وڵاتدا. پەیکەری خەم سەری سڕما لە حەشاماتەکە، پرسی "باشە ئەم خەڵکە بۆ کوێ دەچن؟"

" دیارە نەتبیستووە مامە خەمە؟" پەیکەری جووڵە بە پێکەنینەوە پرسی.

"بۆ چی بووە؟"

"ئەمڕۆ دووی سوور دوای مەلا بانگدان لە شاشەکاندا بەدیار کەوت و بڕیاری دا هەموو خەڵکی شازلاند دەبێ بچن تەوافی پەیکەری پەرستن بکەن لە شاری مەستی."

## ٣

له ناوەندی شاری مەستی منارەیەکی ٢٢٢ مەتریان له ماوەی ٢٤ سەعاتدا دروست کرد. هەرچی کەرەستە و کەلوپەلی بیناسازی هەیە له ٢٠١٦/٢/٢١دا له شاری مەستی کۆکرانەوە و منارەیەکی لوولەییان دروست کرد کە سەری دەگەیشتە هەور. هەوربڕێك بوو هەموو دنیا پێی سەرسام بوون. کاربەدەستانی ولاّتی شازلاند کارەکانیان زۆر خێرایە ئەگەر بێو پڕۆژەکە له بەرژەوەندیی خۆیاندا بێ. پڕۆژەی وا هەیە له شاری مەستی شەش ساڵە پێوەی خەریکن بۆیان تەواو ناکرێ. شەش ساڵ لەسەریەك بودجەی بۆ دانرا و هەر تەواویش نەکرا. پڕۆژەی وا هەیە تەنیا مۆڵەتپێدانەکەی سێ ساڵ دەخایەنێت، هی وا هەیە پێنج ساڵ خاوەن کار دەهێنن و دەبەن، ئەمسەر و ئەوسەری پێ دەکەن دواتریش ڕەتی دەکەنەوە و مۆڵەتی کاری پێ نادەن. لەگەڵ ئەو هەموو کارزەحمەتییەی بۆ پڕۆژەکان دەکرێ، ئەوجا دوای مۆڵەتپێدانیش یەکێ له کاربەدەستەکان یان کۆمەڵێك کار بەدەست پشکیان دەوێ، پشکی گەورە گەورە. ئەگەر خاوەن کار ڕازی نەبێ بە پێدانی ئەو پشکەی

داوای دەکەن، ئەوا هەزار و یەك تەگەرە بۆ پڕۆژەکە دروست دەکەن. ئاکامەکەشی تەواونەبوونی پڕۆژەیەکە.

بەڵام پرۆژەی دروستکردنی منارەکە لە ناوەندی شاری مەستی دەستبەجێ، بەزووترین کات ٥٢٢ ملیۆن دۆلاری بۆ تەرخان کرا و بە ٢٤ سەعات هاتە تەواوکرن. پڕۆژەکە بە بڕیاری کتوپڕی دووی سوور دروست کرا و ڕۆژی دواتر هەر خۆیشی فەرمانی بە خەڵك کرد بچن بەدەوریدا بسوڕێنەوە.

منارەکە بنکەیەکی فراوانی هەیە، بەڵام تا بەرەو سەر بڕوا بچووکتر دەبێتەوە. سەرەکەی خڕە. لە دوورەوە ڕێك بەوە دەچێ کە پیاوی شازلاند هەردەم شانازی پێوە دەکا و بەسەریدا دەڵێ. ئەو شتەی کە هەموو کاربەدەستان بۆی تێدەکوشن و پێیان تێر ناکرێ. شازلاند لە پەیکەرتاشیدا ڕۆمەکان فێر دەکەن و وەستای ئەوانن. شازلاند هێندە پێشکەوتووە لەم بوارەدا ئەوەتا پەیکەرێکی ٢٢٢ مەتر بەرزی لە شێوەی هەرامە لە ناوەڕاستی شاری مەستی دروست کردووە.

٤

پێدا پێدا خەڵك دەگەیشتە شاری مەستی، بێ ئەوەی پشوویێك بدا یەكسەر دەستی دەكرد بە تەوافی منارەكە. كە لە ئاسماندا تەماشای بكەی بە پەیكەری پەرستن دەچێ. شوێنێك لە چوار دەوری پەیكەرەكە بەدەست نەدەكەوت بۆ دانانی پێ. پێش ئەوەی خەڵكی زیندووان و مەنگ بكەن، خەڵكی شاری مەستی، كە نزیكەی ملیۆنێك دەبن، لە بەیانییەوە بەدەوریدا دەسوڕانەوە. ئێستە سێ ملیۆنی هەردوو شارەكەی تریشی هاتە سەر، ئەوا بوون بە چوار ملیۆن. دەمە و ئێوارانی هەمان رۆژ نزیكەی چوار ملیۆن كەس زیاتر بەدەوری پەیكەری پەرستندا دەسوڕانەوە. دیمەنەكە راستەوخۆ لە شاشەیلی شازلاند و تەواوی كەناڵەكانی راگەیاندنی دنیا پەخش دەكرا. ئەمانەی خوارەوە هەندێ لەو سەردێرانەن كە كەناڵە بەناوبانگەكانی دنیا لەبارەی ئەو رۆژە بڵاویان كردەوە:

"دوای حەج، گەورەترین پەرستن لە شازلاند"

"شازلاند پەیكەری هەرامە دەپەرستێ"

"چوار ملیۆن كەس تەوافی پەیكەری پەرستن دەكەن لە شازلاند"

"مەراسیمی پەرستنی سەرۆك لە شازلاند"

## ٥

هێزەکانی سەپاندنی یاسا لە ناو هەردوو شاری مەنگ و زیندووان دەسوڕانەوە تا ئەو کەسە بگرن کە نەچووە بۆ تەوافی پەیکەری پەرستن. تەنانەت لە ناو شاری مەستیش، هێزەکان هەموو کوچە و کولآنێکیان کرد، ئەوەی بیاندیبا، بە منداڵ و پیر و ژن و پیاوەوە، دەیانبرد بۆ تەواف. پەیکەری بازرگانی بەپەلە، دوای کردنی دەیان کونج و کۆلآنی نهێنی، خۆی گەیاندە پەیکەری جوولە و پەیکەری خەم. هەردوو پەیکەری دوایی خۆیان لە کونجێکی شارەکەدا مەلآس دابوو و خەریکی پلان بوون. پەیکەری بازرگانی ئارەقەی شین و رەشی کرد بوو کاتێ گەیشتە لای ئەوان. شەکەت، سوورهەڵگەڕاو، تێنوو، تا سەر ئێسك پەست بوو.

"ئاگاتان لەو گەوادییەیە؟" پەیکەری بازرگانی، دوای ئەوەی دانیشت و پیشێکی خواردەوە، پرسی.

هەردوو پەیکەرەکەی تر سەیری پەیکەری بازرگانیان کرد و بزەیەکیان تێگرت.

"باشە بە چ دەخەننەوە، کاکە ئەوانە وڵاتیان خلاس کرد. فەرموو پەیکەرییان بۆ پەرستنی خۆیان دروست کردووە. وا دەزانن

ئەوانە، نەعوزوبیلا، خوان. ئەوانە لە فیرعەونیش خراپترن،" پەیکەری بازرگانی بەوپەڕی دڵگرانی و سوێوە وای گوت.

"ئەوا خۆیان بە خوا دادەنێن، خەڵکەکەش لەوان خراپتر چونکە دەیانپەرستن،" لەپڕ دەنگێك، لەوان شاراوە، وای گوت.

کاتێ هەرسێکیان ئاوڕیان دایەوە پیاوێکی پیر و نورانیان بینی.

"کێی خۆت بناسێنە،" دوای هەڵسانەوەی هەرسێ پەیکەر، وەك بڵێی خۆیان بۆ پێکدادان ئامادە کردبێ، پەیکەری جووڵە دەنگی دا.

"مەترسن، منیش هی خۆتانم،" پیاوە نورانییەکە وای گوت، کەمێك لە دووری ئەوان دانیشت و بەردەوام بوو، "تا دووی سوور مابێ، شازلاند هەروا وێران دەبێ!"

هەرسێ پەیکەرەکە، بازرگانی و جووڵە و خەم، بەسەرسڕمانەوە تەماشایەکی یەکتریان کرد. تاسان! دوو سێ جار تەماشای پیاوە نوورانییەکەیان کرد و تەماشای یەکتریان کردەوە. دواتر هەر بەچاو بەیەکتریان گوت کە ئەویش لە خۆیانە چونکە دەزانێ دووی سوور چییە.

"نیگەران مەبن، من دەستخۆشی لە پەیکەری جووڵە دەکەم کەوا دووی سووری داهێنا،" پیاوە نوورانییەکە وای گوت.

"باشە، تۆ خۆت نەناساند؟" پەیەکەری خەم پرسی.

" پێم دەڵێن پەیکەری ئیمان!"

## ٦

***بژی گەورەمان***

***بە قوربانی گەورەمان بین***

***بژی گەورەمان***

***بە قوربانی گەورەمان بین***

ئەمانەی سەرەوە وێردی تەواف بوون. چوار ملیۆن کەس پێکڕا ئەمەیان دەگوتەوە. شاری مەستی بە دەنگی خەڵکەکە دەهەژایەوە. دووی سوور و داروودەستەکەی لە ناوەڕاستی پەیکەرەکەدا دانیشتبوون و سەیری گەلیان دەکرد. وەك بڵێی فیرعەون یان ئیمپڕاتۆرە لەوێ بە ئاماژەی سەر سڵاوی لە خەڵك دەکرد و ناوەناوەش دەستی راستی بەرز دەکردەوە و بەرووی خەڵکەکەی دەشەکاندەوە. ناوەڕاستی پەیکەرەکە، بەتایبەتی ئەو قاتەی دووی سووری لێ بوو دەخولایەوە.

هێزەکانی سەپاندنی یاسا پشتێنەیەکی تەناهیی هەواییان دروست کرد بوو بە دەوری ئەو قاتەی کە دووی سووری لێ بوو. ٢٢ کۆپتەر لە ئاسمان بوون بۆ پاراستنی دووی سوور. لە خوارەوەش

هەرچی سوپا هەبوو شانبەشانی هێزەکانی سەپاندنی یاسا پشتێنەیەکی تەناهیان لە چواردەوری خەڵکەکە دروست کرد بوو بۆ ئەوەی کەس ڕێوڕەسمی پەرستن بەجێ نەهێڵێت. تاکوتەرا، لێرە و لەوێ، خەڵك هەبوو هەوڵی دەدا خۆی بدزێتەوە، بەڵام یەکسەر دەکەوتە داوی ئەو هێزانە و دەیانگرت و بن بزریان دەکرد.

٧

هەرچەندە نیوەی خەڵك دەیانزانی ئەوە دووی سوورە لە ناوەڕاستی منارەکە، بەڵام کەس نەیدەوێرا تەنانەت بیریشی لێ بکاتەوە. کەس نەیدەوێرا لە دڵی خۆشیدا بڵێ ئەوەتا دووی سوور. هەرچەندە زۆر کەس باوەڕی بەو تەوافە نەبوو، بەڵام لە ترسان، لە ترسی نانبڕین، لە ترسی بزرکردن، لە ترسی تۆمەتبارکردن بە کەیسی تیرۆر دوای دروستکردنی کەیسێکی سەرسڕهێنەر، کەس بوێری ئەوەی تێدا نەبوو رەتی بکاتەوە. ئەوەی نەشهاتبێ ئێستە وەك پەیکەری بازرگانی، ئیمان، جووڵە و خەم، خۆیان شاردووەتەوە.

لەپڕ دووی سوور هەستا سەر پێ و بە دەست ئاماژەی بێ دەنگبوونی کرد. هەمووی پێکڕا لە یەك چرکەدا

بێ دەنگ بوون. کەس هەست و خوستی نەدەکرد، تەنانەت نەدەوێران هەناسەش بدەن. چاویشیان نەدەتروکاند. هی وا هەبوو ئاو لە چاویدا وەك تاڤگە دەهاتە خوار بەڵام نەیدەوێرا چاوی لێك نێ، یان بسڕێتەوە.

# ٨

دووی سوور دەستی بە قسە کرد:

***"ئەم پەیکەرە چاوی دوژمنان کوێر دەکا،"***

ئەمە یەکەم رستە بوو لە دەمی دووی سوور هاتە دەرەوە. هەرکە خەڵکەکە ئەمەیان بیست یەکسەر کردیان بە چەپڵەڕێزان. دواتر بەدەست ئاماژەیەکی کرد خەڵکەکە لە چەپڵەلێدان بوەستن تا بەردەوام بێ لە وتارەکەی، بەڵام خەڵك نەوەستا، وەك بڵێی لە پشتەوە قورمیش کرا بن تەنیا چەپڵە لێ بدەن. ئاماژەی دەستی دووبارە و سێبارە کردەوە، بێ هوودە بوو، کەس دەستی لە چەپڵەلێدان رانەگرت. ئەوجار بەچاو ئاماژەیەکی بە هێزەکانی سەپاندنی یاسا کرد تا چەپڵەی خەڵك بوەستێنن. هێزەکانیش یەکەمجار بە خۆشی، بەڵام هەر سوودی نەبوو. دواتر بەقسەی ناخۆش، ئەویش سوودی نەبوو. ئیتر هێزەکانی سەپاندنی یاسا دەستیان کرد بە لێدانی خەڵك، تەڕ و وشك بەناو کەوتن. شەلم کوێرم ناپارێزم. لەبەردەمی دووی سوور و دارودەستەکەی، ئەوەی چەپڵەی لێ دەدا کوتایان. هێندەیان لەو خەڵکە دا خوێن جۆگەلەی بەست بوو بەناو شاری مەستیدا. دوای کوتان و لێدانێکی باش،

خەڵکەکە بەخۆ هاتەوە و لە چەپڵەلێدان وەستا. دووی سوور خۆشحاڵ بوو بەوەی خەڵکەکە چەپڵەیان بڕییەوە، دواتر بەردەوام بوو لە وتارەکەی.

١

له ١٩٨٠/٢/٢٢دا، له كۆنترین گەڕەكی شاری مەستی لەسەری كۆڵانێكی باریك و درێژدا چاودێری خانووێكی بچووكی سەوزی دوو دەری دەكرد. ئارەقە له نێچەوانیدا تك تك دەچۆڕایەوە، هەرچەندە ئەو رۆژە زۆر سارد بوو، بەڵام ئەو له دڵەڕاوكێدا له ناو ئارەقەی رەش و شیندا دەگەوزی. شەرواڵێكی فستقی و كراسێكی رەشی بەتۆزی لەبەردا بوو. قژی چڕوپڕ و رەش، وەك وەستای بۆیاغ كە تازە له بۆیاغكردن دەبێتەوە و جیٚ جێی سەری بە پشكە بۆیاغە، جیٚ جێی قژی سپی بوو بوو. دنیای ئەو زۆر بچووكە: بەیانیان و ئێواران و شەوان، ٢٤ سەعات، بەدیار ئەو دوو دەرییە سەوزەدا دۆش دادەمێنیٚ. هەندیٚ جار خەو دەیبردەوە، هەندیٚ جار، كاتیٚ شكیان لیٚ دەكرد یان یەكێكی تر بەوێدا تێدەپەڕی، خۆی له گێلی دەدا و دەڕۆیشت دوو كۆڵان دوور دەكەوتەوە، بەڵام دواتر دەگەڕایەوە هەمان جیٚ.

## ٢

دوای چاوەڕێکردنێکی زۆر، پیاوێك، کە سەروپۆتەلاك و جلەکانی هەر لە هی وەستای دیوار و خانوودا دەچوو، بەخۆی و سەفەرتازەکەی کە پڕ بوو لە پیاز و خیار و تەماتە لەگەڵ چەند لەتە نانێکی تیری، لە ماڵ دەرپەڕییە دەرەوە. کابرای سەر کۆڵانەکە چاوەڕێی کرد تا کرێکارەکە لەوسەری کۆڵان بزر بوو، ئەوجا ئەویش هێدی هێدی خشییە لای خانووە دوو دەرییە سەوزەکە. پێش ئەوەی بگاتە بەردەمی خانووەکە، بەژن زراڤێکی رەنگ گەنمی بە ماکسییێکی سوورەوە هاتە پێش دەرگە و هەر بەچاو ئاماژەی بۆ کابرا کرد کە سەلامەتە و دەتوانێ بێ دوودڵی بێتە ژوورەوە.

کرێکارەکە، دوای تێپەڕاندنی سێ کۆڵان، بیری کەوتەوە کە شاوڵ و خێتی دیواری لە ماڵ لە بیر چووە. بەپەلە بەرەو ماڵ گەڕایەوە. هەر لەسەری کۆڵانی خۆیانەوە کلیلی دەرهێنا و خێرا دوو دەرییە بچووکە سەوزەکەی کردەوە. خێرا خێرا بۆ لای ژووری نووستن چوو تا هاوسەرەکەی ئاگەدار بکاتەوە کە شاڵ و خێتی لەبیر چووە و بۆی بێنێت.

که دەرگەی کردەوە، بە دیمەنی سەر پێخەفەکە چاوی تاریك بوو. بینی پیاوێك بەڕووت و قووتی، قژ پڕی جیێ جیێ سپی چرنووکی توند توند لەو دوو سێوە سەر قاوەییە وردیلانە گرتووە کە لە دارەتی دنیاییێ تەنیا ئەو دوو سێوە بە موڵکی خۆی دەزانیێ. خانووی بەکریێ، کارەکەی تەنیا بەشی گوزەرانی ڕۆژ دەکا، ئەگەر ڕۆژێك نەچیێ بۆ کار، ئەوا دەبیێ بیێ نان دانیشن. شەرواڵی سەوز و کراسی ڕەش، هەریەکە، لەلایەکی ژوورەکە کەوت بوو. ماکسی سووری ژنەکەی هەر پارچەی لەلاییێك بوو، وەك بڵێی دڕندەیەك هاتبیێ و هەپڕوون بەهەپڕوونی کرد بیێ. بینی بێباکانە و تامەزرۆیانە لە نێو هەردوو لینگی هاوسەرەکەی خەریکە هەردوو سێوەکە لیێ دەکاتەوە.

بە بینینی ئەم دیمەنە لە دوورەوە بە پەیکەری بێدەسەڵاتی دەچوو. دەمی لە گۆ کەوت، ئەژنۆی لەرزی، لە تاوان پێڵاوە لاستیکەکەی لە پیێ کردەوە تووڕ بە دەموو چاوی هەردووکیانی دادا. یەکسەر چووە دەرەوە و بە تاکسییێك خۆی گەیاندە بنکەی پۆلیس و شکایەتی کرد.

### ٣

پۆلیس وێنەی کابرا، کە نیگارکێشێك کێشا بووی بەپێی وەسفی کرێکارەکە، بە هەموو کوچە و کۆڵانێکدا بڵاو کردەوە. لەسەر وێنەکە بە گەورەیی نووسرا بوو: داواکراوە. لە خوارەوەش نووسرا بوو: بە زینا تۆمەتبارە. ماوەی دوو مانگ نەك هەر شاری مەستی، شاری زیندووان و مەنگیشیان کرد، نەیاندیتەوە. تەماشای کونیە و فایلیان کرد، ئەم زانیارییانەی خوارەوەیان هێنا بەردەست:

***ناو: پەیکەری نەفسی خراپ***

***پیشە: بەڕەلاکردنی نەفس و زیناکردن***

***تاوانی پێشووی: ٢٢٢ زینای کردووە، زۆربەیان لەگەڵ هاوسەرانی بازرگانان و بەرپرسان***

***شوێنی دانیشتن: گەڕۆك، ماڵی باوکی لە شاری مەستییە.***

***رای خەڵك لەسەری: هەموو کەس لێی بێزارە، تەنانەت دایبابیشی***

چەندان مانگی تر بەدوایدا گەڕان، هیچ شتێک نەبوو. پەیکەری نەفس توانیبووی لە رێگەی قارەمانێکەوە دزە بکاتە شاخ و لەوێ چەك دژی حکوومەت هەڵگرێ. کاتێ زانیان لەسەرچی هەڵاتووە و فایلی چۆنە، یەکسەر کردیان بە بەرپرسی ئۆپەراسیۆنی گەورەی نهێنی.

٤

پەیکەرەکان، جوولّە، خۆشەویستی، نووسین، خەم، بازرگانی و ئیمان، خەریکی ئامادەکردنی هەزاران پەڕە کاغەزی بچووك بچووك بوون. سەتان بەند کاغەزییان لابوو، هەر یەکە مقەسێك و خامەییێکی سووری لا بوو. هەر کاغەزێکی ئەی فۆریان دەکرد بە ١٠ پارچەی بچووك و لەسەریان دەنووسی: هەمووی خەتای دووی سوور و دەستەکەیەتی.

پەیکەری جوولّە ئارەقی تەوێڵی سڕییەوە و بەدەنگێکی هێمن گوتی: "هاوڕێیان، ئاگاتان لە پەیکەری نەفس هەیە بەم دواییانە چی کردووە؟"

پەیکەرەکان بەدەم بڕینی کاغەزەکان و نووسینەوە بزەیەکیان هاتێ. پەیکەری نووسین بە دەست قژی بۆ سەرەوە برد و گوتی: "هەموومان باکگراوندی پەیکەری نەفس دەزانین. باکگراوندی تژییە لە زینا."

"پەیکەری نەفس نەفسی خۆی بەڕەللاّ کردووە و وەها ئاسان پێی کۆنترۆڵ ناکرێ،" پەیکەری ئیمان ئەوەشی خستە سەر قسەکانی پەیکەری پێشوو.

"سەیرە لەم وڵاتەدا ئەوەی نەفسی بەڕەڵلا کردووە بازرگان و کاربەدەستانن،" پەیکەری بازرگانی دوای لێدانی قومێك لە بوتڵە ئاوەکەی بەردەمی، وای گوت.

"ئێ خۆشت خۆ بازرگانی برام،" پەیکەری ئیمان پێی گوت.

دواتر پەیکەری خۆشەویستی قسەکانی بڕی و پرسی: "پەیکەری جووڵە پێت نەگوتین کە ئەمجارە پەیکەری نەفسی خراپ چی کردووە؟"

هەموو پێکڕا گوتیان: "خۆ ڕاست دەکەی، دە کاکە پێمان بڵێ بزانین چی بووە."

## ٥

پەیکەری جوولە مقەسەکەی لە پێش خۆی لەسەر کاغەزێك دانا و هەستاوە سەر پێ و تەواوی ڕووداوەکەی لەبارەی پەیکەری نەفسی خراپ بۆیان گێڕایەوە:

یەکێ لە پاسەوانەکانی پەیکەری نەفسی خراپ ژنێکی تا بڵێی جوان و بەرچاوی هەیە: لەشڕێك، دەموچاو وردیلەی ساف و گەش. ئەگەر فاشن هەبوایە لە شازلاند، ئەوا بێگومان یەکێ لە کۆمپانیاکان بۆ پێشاندانی جلە تازەکانیان بەکاریان دێنا، هێندە باریك و شیرین بوو. بەڵام بەداخەوە پەیکەری نەفس لێی زەوت دەکا و پاسەوانەکەش دەر دەکا. جا چ زەوتکردنێك، نامەردانە و دڕندانە.

پەیکەری نەفس زۆر حەزی لە خواردنە. بەکورتی: زۆر نەوسنە. وەها دەکا بەسەر ماڵێك دادەدا تا خواردنی بۆ ئامادە بکەن. ڕۆژێك لە ڕۆژان، بەسەر ماڵی ئەو پاسەوانەی دادا کە ماوەی شەش ساڵە هەموو ژیانی تەرخان کردووە بۆ پارستنی پەیکەری نەفس. بۆ هەر کوێیەك بچێ، پاسەوان بەخۆی و تفەنگ بەدواوەیەتی. هەرکە پێ دەنێتە ناو ماڵی پاسەوان تا ئەو ساتەی دەچێتە دەرەوە، چاوی

لەسەر ژنەکەی هەڵناگرێ. دوو سێ جاریش کەوچکی پڕ سوپی بەهەڵە بۆ لووتی دەبا و سوپەکە هەموو بە سمێڵە ئەستوورەکەیدا دێتە خوارەوە. هێندە دڕندانە شەیدای دەبێ، هەر لەوێ سیناریۆیەك دادەنێ تا پێی بگا.

## ٦

ڕۆژی دواتر، پاسەوانەکەی بەکارێك دەنێرێتە دەرەوە. پەیکەری نەفس، کە ئێستە یەکێکە لە گەورەترین کاربەدەستانی وڵاتی شازلاند لەبەرئەوەی خەباتێکی زۆری کردووە لە شاخ، یەکسەر دەچێتە ماڵی پاسەوان. بەزۆری و بەلێدان و هەڕەشەکردن هەمان سیناریۆی ڕۆژی ١٩٨٠/٢/٢ لەگەڵ ژنی پاسەوانەکە دووبارە دەکاتەوە. چڕنووکی لە هەردوو سێودا دەباتە خوار.

پاسەوان لە ڕێی گەڕانەوەی بۆ ئۆفیسی پەیکەری نەفس، سەرێك لە ماڵەوە دەدا. کە دێتە ژوورەوە، ئەوەی ئەو دەیبینێ هیچ کەس لە دنیا پێی قەبوڵ ناکرێ. ناکاتە نامەردی بە تفەنگەکەی دوو گوللە بە پەیکەری نەفسەوە دەنێ. ژنەکەشی، کە هەردوو لا ڕوومەتی دوو تاڤگەی فرمێسکە و هەردوو سێوەکەشی خوێنی تێدا چزاوە و جێی چڕنووکی پەیکەری نەفسیان پێوە دیارە، لە باوەش دەگرێ، دڵی دەداتەوە و دایدەپۆشێ.

لەبەرئەوەی پەیکەری نەفس لە ریزی فیرعەونەکانە لە وڵات، زۆر بەخێرایی چارسەر دەکرێ. دەڵێن سێ ملیۆن دۆلاری لەخۆی داوە چونکە بەخێراترین کات گەیەنراوەتە یەکێ لە نەخۆشخانە هەر پلە

یەکەکانی وڵات کە بە هیچ شێوەیەک مرۆی چین مامناوەند و تەنانەت چینی زەنگینیش، لەبەر گرانییەکەی، بۆیان ناکرێ بچنە ئەوێ بۆ چارەسەر.

دوای دەستبەکاربوون، زۆر دەستخۆشی لێ دەکرێ لەلایەن سەرووی خۆی لەو کارەی کە ئەنجامی داوە. ئەمە سەیر نییە چونکە لە وڵاتی شازلاند هەر کاربەدەستێکی پلە بڵند ناماقوڵییێک، دزییێک و بێ رەوشتییێک بکا لەباتی دەرکردن و سزادانی یەکسەر دەستخۆشی لێ دەکەن، زۆربەی جاریش پلەی بەرز دەکەنەوە و مەدالیای شەرەفی پێ دەدەن.

## ٨

دوای چەند رۆژێك، کۆمەڵێك چەکدار دەنێرێتە سەر ماڵی پاسەوانەکەی، بەزۆر خۆی و ژنەکەی دەهێننە بەردەمی. ئەوەش سەیر نییە چونکە لە وڵاتی شازلاند هەر کاربەدەستە و بۆ خۆی حکوومەتێکە و سوپایەکی تەواوی هەیە. هەر کارێك بیەوێ دەیکا، کەسیش ناڵێ لە پشتی چاوی دوو برۆیە.

"زۆر راشکاوانە پێت دەڵێم: لەمڕۆ بەدواوە ژنەکەت دەبێتە هی من،" پەیکەری نەفسی خراپ، دوای دانانی لوولەی تفەنگ لەسەر سەری، وا بە پاسەوانەکە دەڵێ.

ژنەکە لەتاو پاسەوانی مێردی خێرا دەڵێ: "من بۆ تۆ دەبم، بەڵام واز لەو بێنە."

پاسەوان خۆی دەپچڕێنێتەوە، بەڵام قۆنداخێکی لە پشتە سەری دەدەن و بێ هۆش دەکەوێتە سەر زەوی. دواتر دەیبەن لە دووری شار فڕێی دەدەن. دوای چەند سەعاتێك دێتەوە هۆش خۆی، یەکسەر دەچێتە یەکێ لە نزیکترین بنکەی پۆلیس لەو ناوەدا، شکایەت دەکا. دوای چەند رۆژێك پۆلیس دەچێتە لای پەیکەری

نەفس و پێی رادەگەیەنن کەوا یەکێ هاتووە و شکایەتی لێی کردووە.

"کاکە ئەوەی ئەو کابرایە باسی کردووە هەمووی هەڵە و بوختانە. ئەو ژنە ژنی خۆمە،" پەیکەری نەفس وا بە پۆلیس دەڵێ.

پۆلیسەکان تەماشایەکی یەکتر دەکەن و برۆی تاسان لە یەکتر بڵند دەکەن.

"کاکە من شکایەتم لەو پیاوە هەیە چونکە بەو شتە بێ بنەمایە شکاتی لە من کردووە،" پەیکەری نەفس بە رژدی و بێتووکانە، وەك بڵێی غەدری لێ کرا بێ، وا بە پۆلیس دەڵێ.

پۆلیسەکان یەکسەر پاسەوان داوێنە ژووری. دوای شەش مانگ بەری دەدەن. ئەمەش سەیر نییە چونکە لە وڵاتی شازلاند ئەوەی کاربەدەست دەیلێ هەر ئەوە راستە. قسەی قوربەسەرێکی وەك پاسەوان هەرگیز بەهەند وەرناگیرێ.

## ١

تەواوی هێزەیلی سەپاندنی یاسا و نینجاگەلی عادی بەدوایدا کەوت بوون. ئەویش شازلاندی لێ بووبوو بە کونە مشك، سەری بەهەر کونێکدا دەکرد مەفرەزەیەکی چەکدار رووبەڕووی دەبووەوە. مرۆییێکی برۆ ئەستوور، چاو مەیلەو زەردی قوولێ، سمێڵ پانی ورگ ئەستوور. کراس و پانتۆڵێکی قاوەیی، کە بە هێمای ژمێریاریی کۆ، کەم، دابەش و جاران نەخشێنرا بوو، لەبەردا بوو. بەژن کورتی ئەسلەح: پیاوێکی کورت و ئەستووری کەللە زل. ورگ و بەز و گەزەکەی رێگر نەبوون لەوەی وەك سووسکە لە بن دەستی هێزەیلی چەکدار دەرپەڕێ و دەربازی بێ. یەك هەفتەی رێك، شەو و رۆژ، رای کرد و خۆی شاردەوە. دواجار بێ بڕست و هەدا خۆی دا بەدەستەوە.

## ٢

ئەو گەورەترین تاوانبارە. ماوەی ٢٢ ساڵە وەسڵ تەوزیر دەکا. هێندە لێزان و شارەزا بوو کەس هەستی پێ نەدەکرد. سەتان جۆر وەسڵی هەبوو. ساختەچییێك بوو بێ وێنە. ٢٢ ساڵە پارەی وڵات هەڵدەلووشێت.

پەیکەری جووڵە، بازرگانی، خەم و ئیمان ئاشکرایان کرد ئەو دەمەی سەیری کۆمەڵێك وەسڵیان کرد کە هەریەك لەوی تر جیاواز بوو. بەیاننامەیەکی نهێنیان لەسەر دیوارەکان بڵاوکردەوە دوای ئەوەی ماڵی تاوانبارە مەزنەکەیان دۆزییەوە. هێزەیلی چەکدار بەدەم بەیاننامەکەوە چوون و دوای ماوەییێکی زۆر توانیان دەسگیری بکەن.

تاوانبارەکە خانووێکی سەت مەتری بچووکی هەبوو لە گەڕەکی ساختەچییان. لە دەرەوە تەماشای خانووەکەت بکردبا شێوەی وەسڵێکی نایابی هەبوو. هەر خۆیشی دیزاین و نەخشەی خانووەکەی دانا بوو. خانووەکە خانووێکی ئاسایی نەبوو ژووری نووستن، مەتبەخ و دانیشتن، هۆڵ، کۆگا، گەرما و ئاودەستی هەبێ. تەنێ دوو دەرییە رەشە گەورەکەی بە دەرگەی ئاساییی

ماڵان دەچوو. ئەودیو دەرگا هۆڵێکی گەورە بوو تژی لە کەلوپەلی چاپ و چاپەمەنییێکی گەورەشی تێدا بوو. وەك هۆڵێکی گەورەی ساختەکرن دەهاتە بەرچاو. دیوارەکانی بە وەسڵ داپۆشرا بوون.

لەوێ هەموو جۆرە وەسڵێکی دروست دەکرد.

٣

ئەوەی تاوانباری لە نزیکەوە بناسیبا بە کوڕی وەسڵ بانگی دەکرد. هەندێ دەیانگوت کاتی خۆی لە وەسڵ بووە لەدایك!

شێوەی خۆی لە بەیانیان لە وەسڵێکی سوور و سپی دەچوو، ئێواران بە سەوز و شەوانیش بە وەسڵی زەرد دەچوو. لە دوورەوە بە پەیکەری وەسڵ دەچوو. خەڵکی دەگێڕنەوە دەڵێن کاتی خۆی نان نەبووە بیخوا، بەڵام کە دەستی داوەتە کاری وەسڵ بە ماوەییێکی زۆر کەم حسێبی تێپەڕاندووە.

چیرۆکی سەیر سەیری لێ دەگێڕنەوە. دەڵێن بەیانیان، زوو زوو، دەچێتە سەر شاخ. لەوێ پەیکەرێکی گەورەی لە وەسڵ دروست کردووە، بەیانیان دەچێ کڕنووش بۆ وەسڵ دەبا. دەڵێن بانقەیلی ئەوڕوپای پڕ کردووە، ئەگەر بێو پێنج سەدەی تر دانیشێ و هیچ کار نەکا دەتوانێ وەك پاشایان بژی. دەڵێن رکی دنیای لە هاوسەرگیری دەبێتەوە، نایەوێ و حەز ناکا ژن و منداڵی هەبێ.

جارێك لێی دەپرسن بۆ ژنێك ناهێنێت، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:

"ژنم هەبێ وەسڵم نابێ. هەرچی وەسڵی دنیا هەیە هەتبێ بەشی ژنەکەت ناکا!"

هەندێ دەڵێن پێش ئەوەی کاری وەسڵ بکا، ژنێکی هەبووە بەڵام خێرا ژنەکەی لە بن دەستی رای کردووە. گوایە ژنەکە زۆر حەزی لە گەشت، سەیران و دنیادیتن بووە. هەر کاتێك داوای لە پەیکەری وەسڵ کردبا بۆ شوێنێك، خێرا دەچوو تاکسییێکی دەهێنا و بە چەند دەقیقەیەك دەیبردە شوێنەکە. لە تاکسی داینەدەبەزاند، بگرە هەر لە ناو تاکسییەکە بە چەند چرکەیەك پێی دەگوت: "ژنەکە ئەمە ئەو شوێنەیە کە داوات کرد بوو، باش بیبینە." پاش چەند چرکەیەك دەیگوت: "ئێ ، ئەوە دیتت، یاللا با بڕۆین." ژنەکەش ئەم جۆرە ژیانەی پێ قەبوڵ نەبووە و بەجێی هێشتووە. لەوساکەوە تا ئێستە تەنانەت بیریش لە ژنهێنان ناکاتەوە. زراوی لە ژن چووە.

٤

پەیکەری جوولە، بازرگانی، خەم و ئیمان زۆریان کەیف پێهات کاتێ زانیان پەیکەری وەسڵ گیراوە. ئەوان قەت چاوەڕێی بەرنامەی شاشەگەل نەبوون و هێندەش تەماشایان نەدەکرد، مەگەر بەڕێکەوت بەرچاویان کەوتبا، یانیش شاشە گەورەکانیان هەر دەکەوتە بەرچاو چونکە کەس ناتوانێ ئەو شاشانە نەبینێ. بەڵام دوای گرتنی پەیکەری وەسڵ، خولەك بە خولەك سۆراخی شاشەگەلیان دەکرد دەیانگوت ئێستە نا ئێستە پەیکەری وەسڵ لە شاشەگەل پێشان دەدرێ. چەندان رۆژ بەم شێوەیە چاوەڕێی شاشەیل بوون، بەڵام هەموو بەرپرسەکان چەندبارە بەدیارکەوتن و وتارە درۆیینەکانیان خوێندەوە، بەڵام پەیکەری وەسڵ لە هیچ شاشەیەك بەدیار نەکەوت.

هێندە چاوەڕێیان کرد پەیکەری وەسڵیان لە بیر چووەوە. ئیتر ئەوانیش وازیان هێنا. بەیانییێك لەسەر قەڵا پەیکەرەکان دانیشتبوون. لەناکاو پیاوێکی کورت و ئەستووریان بینی، شیك و پۆشتە، وا لەسەر شاشەکان قسان دەکا. پەیکەری جوولە لێی ورد بووەوە و پرسی: "هاوڕێیان، ئەم پیاوە پەیکەری وەسڵ نییە؟"

زۆربەی پەیکەرەکان پێیان وابوو پیاوەکە پەیکەری وەسڵ نییە و بەرپرسێکی ترە. پەیکەری جووڵە و بازرگانی پێیان وابوو ئەوە خۆی بوو.

"کاکە پەیکەری وەسڵیان وەها لە ناو برد، کەس هەر لە بیریشی نەماوە،" پەیکەری خۆشەویستی وای گوت.

سەرگەرمی ئەو سوالفە گەرمە بوون ئاخۆ پیاوە کورتە ئەستوورە قات لەبەرەکە هەوە یان هەو نییە. پاش چەند خولەکێك لە ژێر شاشەکە بەگەورەیی نووسرا:

"پەیکەری وەسڵ: سەرۆکی ئەنجومەنی وەسڵ!"

هەر هەموو بەم ناونیشانەی پەیکەری وەسڵ تاسان. حکوومەت پەیکەری وەسڵی دەسگیر کرد و ئەنجومەنێکی گەورەی کردەوە بەناوی وەسڵ و ئەویشی کردە سەرۆکی.

"سیفەتێکی تری ئەم وڵاتە ئەوەیە ئەوەی دڵسۆز و دەسپاك بێ بە گێلی دەزانن، ئەوەی دز و جەردە و نادڵسۆز بێ بە مەرد و پیاوی دەزانن. پێی دەڵێن بەخوا زیرەکە بۆ خۆی خۆی پێگەیاند،" پەیکەری جووڵە وای گوت.

٥

پەیکەری وەسڵ لەگەڵ تەواوی کاربەدەستەیل و وەزارەتەیل ڕێك کەوت بۆ دروستکردن و پڕکردنەوەی وەسڵ. لە فەرمانگەی پێشوازیکردنی ئاژەڵان، کە مانگانە ٥٠٠ هەزار دۆلار وەك نەسریە وەردەگرن، مانگانە پێویستی بە ٥٠ هەزار دۆلارە بۆ پێشوازیکردن لەو ئاژەڵە کێویانەی لە زنجیرە شاخەکانی دراوسێوە دێنە ناو خاکی شازلاند. لە نیوەی هەر مانگێکەوە تا سەری مانگ دەست دەکەن بە تەرتیبکردنی وەسڵ بۆ جێکردنەوەی ئەو ٤٥٠ هەزار دۆلارەی کە مانگانە دەمێنێتەوە. ئەنجومەنی پەیکەری وەسڵ بەم کارە هەڵدەستێ، پارەکەش بەسەر خۆیاندا دابەش دەکەن و وەسڵەکانیش دەچێتەوە بەردەمی ئەنجومەنی دارایی وڵات.

فەرمانگەی پاککردنەوەی گەڕەکەکان هەر شتێ بکڕێ ١٢ قات دەینووسن. فەرمانگەی بێڕێزکردنی گەل، کە مانگانە یەك ملیۆن دۆلار نەسریەکەیەتی، هیچ سەرف ناکا و بەسەتان وەسڵ پڕ دەکەنەوە و دەینێرن بۆ ئەنجومەنی دارایی وڵات. ئەم ئەنجومەنەش مانگانە نامەی دەسخۆشی و پێزانین بۆ ئەو فەرمانگەیە دەنێرێت کە هیچ پارە ناگەڕێنێتەوە و هەر هەمووی

سەرف دەکرێ. ئەوەی پارە بگەڕێنێتەوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکەن. ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەو کەیسانەی کە دڵسۆزەکەیان لەناو برد بەتاوانی ناپاکی لە وڵات. ئەمەی خوارەوە کاتی دادگەییکردنی پەیکەری دڵسۆزییە! پەیکەری وەسڵ، هەر خۆی، دادوەر بوو!

***پەیکەری وەسڵ: لە چ فەرمانگەیەك کار دەکەی؟***

***پەیکەری دڵسۆزی: فەرمانگەی دادگە گشتییەکانی وڵات.***

***پەیکەری وەسڵ: نەسریەی مانگانەتان چەندە؟***

***پەیکەری دڵسۆزی: یەك ملیار دۆلار.***

***پەیکەری وەسڵ: ئەی بۆ ئەم مانگە سێ چارەگی ئەو پارەیەت گەڕاندووەتەوە؟***

***پەیکەری دڵسۆزی: من ئەم مانگە دەست بەکار بووم و بینیم پارەیەکی زۆر دیار نامێنێ و بە وەسڵ شوێنی بۆ دەکرێتەوە. بۆیە منیش چاکسازیم کرد و کەمترین پارەم سەرف کرد. ئەوەشی گەڕاندوومەتەوە ئەو بڕە زۆرەیە کە ماوەتەوە.***

***پەیکەری وەسڵ: نەخێر، دەبێ هەموو مانگێك هەر هەمووی سەرف بکەی.***

***دڵسۆز: بەڵام گەورەم ئەم بڕە پارەیە زۆر زۆرە.***

**پەیکەری وەسڵ: دەتەوێ بڵێی تۆ باشتر لە ئێمە دەزانی و شارەزاتری؟**

**پەیکەری دڵسۆزی: نەخێر گەورەم، بەڵام من باشتر لە ئێوە دەبینم و دڵم بە وڵاتەکەم و خەڵکە هەژارەکە دەسووتێ.**

## ٦

پەیکەری وەسڵ فەرمانی دەکرد، فەرمانەکەش بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

***"پەیکەری دڵسۆزی، بەڕێوەبەری فەرمانگەی دادگە گشتییەکان، لە هێڵی دڵسۆزی لایداوە بەوەی دڵی بە وڵات و خەڵکی هەژار دەسووتێ، هەروەها تاوانێکی گەورەشی ئەنجام داوە بەوەی ناتوانێ برە پارەی دابینکراو سەرف بکا و وەسڵ بنێرێتەوە لای ئەنجومەنی دارایی وڵات. بۆیە بڕیارم دا کە لەم ساتەوە لە کارەکەی دەر بکرێ و لە ناوەڕاستی بیابان فڕێ بدرێ. با بۆ خۆی لەوێ بژی!"***

پەیکەری وەسڵ، وێڕای ئەوەی سەرۆکی ئەنجومەنی وەسڵ بوو، بوونی لە هەر هەموو فەرمانگە گشتییەکاندا هەبوو. لە یەك ساتدا ئاگای لە هەموو ئەو شوێنانە بوو کە مانگانە پارەیان دەمایەوە و بە وەسڵ جێیان بۆ دەکردەوە. واتە یەك پەیکەری وەسڵ نەبوو،

کۆپی کرا بوو، لە هەر شوێنێك بۆنی پارەی لێ بهاتبا و پێویستیان بە وەسڵ هەبا، ئەوا کۆپییێکی پەیکەری وەسڵ لەوێ بوو.

## ٧

چەند هەفتەیەك دوای بە بیابانکردنی پەیکەری دڵسۆز، دووی سوور و پەیکەری گومان و ئەوانی تر لە بۆنەیەکی زۆر گەورەدا رێزیان لە پەیکەری وەسڵ نا و خەڵاتیان کرد. دوو سەت و حەفتا و دوو ملیۆن دۆلارییان لەو بۆنەیە سەرف کرد. تاجی دڵسۆزی و شەرەفیان لەسەری پەیکەری وەسڵ کرد. وەك یەکێك لە دەسکەوتە گەورەکان، بەردەوام وێنەی پەیکەری دڵسۆزییان پێشان دەدا لە شاشە گەورەکان کە چۆن و لەبەرچی کەوتووەتە بیابان. پەیکەری وەسڵ لەم بۆنەیەدا وتارێکی پێشکەش کرد کە راستەوخۆ لە هەموو شاشەکاندا پەخش دەکرا:

"من و وەسڵ دوو روحین لە یەك جەستەدا. نا چاکترە بڵێم کە شازلاند و من و وەسڵ سێ روحین لە ناو یەك جەستەدا. کەواتە تا من و وەسڵ مابین شازلاند هەر لە پێشەوە دەبێ."

خەڵکەکە هەمووی کردی بە چەپڵەڕێزان، تەنانەت دووی سووریش هەستابووە سەر پێ و چەپڵەی لێ دەدا.

## ٨

پەیکەری جوولە و یاوەرانی لە یەکێ لە شاشەکان لە دەرەوە ئەمەیان بینی. دیمەنەکە زۆر کاری تێیان کرد.

"تەماشاکە، دەیانەوێ بەم شێوەیە وڵات دروست بکەن..." پەیکەری خەم گوتی.

"من لەوە دەترسم رۆژێك بێ تۆش رەوانەی بیابان بکەن،" پەیکەری جوولە رووی لە پەیکەری ئیمان کرد و وای گوت.

"نا مەترسە، منیش وەسڵێ پڕ دەکەمەوە،" پەیکەری ئیمان بەم قسەیە هەموو پەیکەرەکانی تاساند، ئەوانیش هەر هەموو نیگایەکی گوماناویان پێی دا.

"مەترسن، من نایدزم و ناهێڵم بچێتە ناو گیرفانی دزە گەورەکان، بگرە من یارمەتی هەژارانی پێ دەدەم. وەك هەر فەرمانگەیەکی تر، پارەیەکی زۆر لە فەرمانگەکەی ئێمەش دەمێنێتەوە، بەڵام من بەسەر هەژاراندا تەخشان و پەخشانی دەکەم."

"کەواتە تۆ رۆڵی رۆبن هود دەبینی؟" پەیکەری خۆشەویستی وای گوت.

هەر هەموویان پێکەنین و هەر یەکە بەرەو ماڵی خۆی گەڕایەوە.

## ١

چیمەنەکان لە بێ ئاوییان زەرد و سیس بووبوون، خەزەڵی درەختە ناشادەکانی باخچەکە لکێکیان پڕ لە فرمێسك و لکێکیان پڕ لە حەسرەت ملیان دادابووەوە. یاریی تێنس دوو گەنجی لە ئارەقی ڕەش و شین دەگەوزاند. موزیکێکی نەرم و تژی لە نم لە ژوورەوە سەدای دەدایەوە. ئەوەی لەدیار یارییەکەدا دانیشت بوو وەك سەرخۆش بەدوای روحی موزیکەکەدا چوون. یەك یەك ژوورەکانیان کرد تا سەرچاوەی موزیکەکەیان دۆزییەوە.

گەنجێکی سەر قژنی موو زەرد، وەك چۆن دایکێك مەلۆتکەکەی لە ئامێز دەگرێ، ئاوا سازەکەی لە باوەش گرتبوو و خەمدانتەقیو دەیژەنی. هاوڕێیەك شوێنی لە نێوان خۆی و گەنجێکی تر کە ون بووبوو لە دنیای موزیکدا بۆ چەند کەسێك کردەوە. پۆلێك گەنج گوێیان لە گەنجێکی موزیکژەن دەگرت کە هەموویانی تێکەڵی خەیاڵێکی ئاسوودە کرد بوو.

یەکێك لە گەنجەکان جارجارە سەیری لاپتۆپەکەی پێشە خۆی دەکرد و دووی تریشی پێوە سەرقاڵ دەکرد. گوێگران بەو رەفتارە مگێز و چەشەیان تێك دەچوو. هەر جارە و یەکێك دەیویست

بەڕوویاندا بتەقێتەوە بەڵام دانیان بە خۆیاندا گرت. کاتێ کاسە پڕبوو و لەسەری ڕژا، موزیکژەن خۆی پێیاندا تەقییەوە :

***"چین ئێوە؟ جەرگتان لە تەنەکە دروست کراوە؟ بۆ گوێ ناگرن؟ دەبێ رێز لە هەستەکان و موزیك بگرن."***

## ٢

گەنجە موو زەردەکە کارەکتەرێکی هێمن، بیٚ رك، بیٚ فیز، نەرمونیانی هەبوو. هەموو ژیانی لەگەڵ موزیك دەبردە سەر. بەکورتی: لەگەڵ موزیك دەژیا. پێش ئەوەی هەر ژەمێك بخوا ئاوازێکی سلۆی دەژەنی، ئەوجا دەستی دەکرد بە نانخواردن. بیر و چەشەی موزیکی هێندە تیژ و بەهێز بوو دەیتوانی دەسبەجیٚ ئاوازی نویٚ و تازە بژەنیٚ. هەر مرۆییێك، هەر شتێك، هەر رووداوێکی دیبا یەکسەر ئاوازێکی تازە بۆ دەژنی. تا ئێستە هیچ ئاوازێکی دووبارە نەژەنیوەتەوە. هەر بۆیە بە پەیکەری موزیك بانگیان دەکرد.

پاش ئەوەی بەسەر ئەو دوو گەنجەدا تەقییەوە، خێرا سازەکەی خستەوە ناو جانتاکەی، بەپشتی خۆی دادا و لە شوێنەکە، کە سەنتەرێکی گەنجان بوو، هاتە دەرەوە. لەبەرئەوەی سەنتەر و رێکخراوەکانی وڵاتی شازلاند کەسیان پیٚ نەدەگەیاند، هەر تەنیٚ ناو بوون، پەیکەری موزیك خۆبەخشانە بەنێو گەنجاندا دەسوڕایەوە، لەو سەنتەر بۆ ئەو سەنتەر، لەو رێکخراو بۆ ئەو رێکخراو، ئاوازی تازەی بۆ دەژەنین بۆ ئەوەی کەمێك گەنجەکان

بوروژێنیٚ. ئەو پێی وابوو ئەگەر پەنجا ساڵ بەو شێوەیە بۆ گەنجان بژەنیٚ، تەنانەت یەك کەسیش بگۆڕیٚ بە هۆی ئاوازەکانی ، ئەوا بەسە بۆی. بەڵام گەنجانی وڵاتی شازلاند هیچ کاریان تیٚ ناکا لەبەرئەوەی تووشی ئیفلیجی مێشك و تیرۆری بیرکردنەوە هاتوون.

## ٣

پەیکەرەکانی وڵات لە چەپەکە نهێنییەکەی خۆیان هەر خەریکی پلان و تاتویێ بوون. کەوێڵێکی بچووك، لە شەمچە دروست کرا بوو. راستییەکەی پەیکەرەکان کولانەیەکی جێگیریان نەبوو. دەیانتوانی لە هەر شوێنێك کولانەیەك دروست بکەن. تەنیێ یەك مەرج هەبوو بۆ دروستکردنی چەپەك بە شەمچە ئەویش سەلامەتی بوو. هەر شوێنێك سەلامەت و دوورەدەستی هێزەکانی سەپاندنی یاسا بیێ، ئەوان یەکسەر بە شەمچە کولانە یان چەپەکێکی لیێ دروست دەکەن. چەپەکی ئەوان لە یەك تاقە ژووری سیێ بە سیێ پێك دەهات. هەر کاتێکیش کاریان تێیدا تەواو بووبایە، ئەوا یەکسەر ئاگرێکیان لە یەکیێ لە شەمچەکان دەدا و هەر هەموو پێکڕا گڕی دەگرت و چەپەکەکە نەدەما. پاشماوەی هەر چەپەکێك تابلۆییێکی لە دوای خۆیدا بەجیێ دەهێشت.

پەیکەرەکان، جووڵە، خەم، خۆشەویستی، ئیمان، بازرگانی و نووسین، ئەمجارە لە گەڕەکێك چەپەکێکیان دروست کرد. کۆڵانە تەسك و باریکەکانی گەڕەکەکە قیرتاو نەکرابوون، خانووەکان هەمووی لەدار دروست کرا بوون. ئەم گەڕەکە شوێنی رابواردنی

بەرپرس و بازرگانەکانی وڵات بوو. نزیکەی ٢٢٢٢ خانووی تێدا بوو. ئێواران لە سەعات چوارەوە تا بەیانی بەبەر نەدەکەوت.

لەوێ خەریکی تاتوێکردنی ئەوە بوون چۆن لەسەر دووی سوور بتەقێننەوە، تا هەموو وڵات تێبگەن.

"بوەستن، گوێتان لەم موزیکە نەرمە نییە؟" پەیکەری جووڵە گوتی.

## ٣

پەیکەرەکان بێ دەنگ بوون و هەستیان راگرت. هەر هەموویان گوێیان لە موزیکێکی سیحراوی بوو. پەیکەری ئیمان بەدوای لەرەی ژێیەکاندا چوو، دوو کۆڵان ئەولاتر، پەیکەری موزیکی بینی لەسەر دارێك دانیشتووە و ئاوازێکی تازە بۆ ئەو گەڕەکە دەژەنێ: ئاوازێکی خەمناك.

"من هەمیشە گوتومە ئیمان و موزیك تەواوکەری یەکترن،" پەیکەری ئیمان پەیکەری موزیکی بەم قسەیە لە دنیای موزیکدا پساند.

"واتە ئەوەی ئیماندار بێ موزیکژەنە و موزیکژەنیش ئیماندار،" پەیکەری موزیك، دوای هەڵگرتنی قامکەیلی لەسەر سازە مەیلە و سوورەکەی، وای گوت.

"مەرج نییە هەموو دەم وابێ،" پەیکەری ئیمان دوای ئەوەی گەیشتە بەردەمی پەیکەری موزیك وای گوت، ئەوجا دەستی لەسەر شانی دانا و بەردەوام بوو: "بەڵام لێکتێگەیشتنێکی قووڵ هەیە لە نێوان ئیمان و موزیك. کاتێ لە نوێژ بەرامبەر خوای گەورە و تاك و تەنیا رادەوەستم و سورەتی فاتیحە بەدەنگ دەخوێنم، هەردەم

موزیکەکەی وام لێ دەکا لەگەڵ یەکە یەکەی وشەکان باڵ بگرم و فرمێسک هەڵڕێژم. نوێژی من بێ موزیک وەک ئەوە وایە دەروێشێک زیکر بکا و هزر و روحی لای خوای میهرەبان و باڵادەست نەبێ."

"یەکەم جارە ببیستم ئیماندارێک بەم شێوە دانسقە و جوانە لە موزیک بڕوانێ،" پەیکەری موزیک بزەیەکی هاتێ و گوتی، پاشان سازەکەی خستەوە ناو جانتاکەی و بەردەوام بوو: "زۆربەی نوێژکەرەکان رکیان لە من دەبێتەوە، بەچاوێکی سووک و بێ دین تەماشام دەکەن. خۆزگە هەموو نوێژکەرێک وەک بەڕێزت ئیماندار و موزیکدۆست دەبوو. بەڵام لەم وڵاتەدا تەنانەت ئاینیش بووەتە بنێشتەخۆشەی سەر زاری منداڵان و هەرچی دێ دوو رکات نوێژ دەکا و هەموو ئەوانی تر بە کافر دەزانێ،" پاشان هەستا سەر پێ، " بەهەر حاڵ، من ئێستە دەبێ بڕۆم."

"بۆ کوێ؟" پەیکەری ئیمان پرسی، "تەنانەت یەکتریشمان نەناسی!"

"من ناوم پەیکەری موزیکە."

"منیش پەیکەری ئیمانم،" دەستی راستەی بۆ تەوقەکردن رووە و ناوقەدی پەیکەری موزیک درێژ کرد.

٤

دوای تەوقەیەکی گەرم، پەیکەری ئیمان گوتی: "چەند هاوڕێیەکم لەگەڵ دایە، ئەوانیش گوێیان لە سەدای موزیکی بەڕێزت بوو، بێگومان لە نزیکەوە بتبینن خۆشحاڵ دەبن."

هەردوو پەیکەر پێدا پێدا بەرەو چەپەکە شەمچەییەکە چوون. تا گەیشتنە ئەوێ درێژەیان بە سوالفەکەیان دا لەبارەی ئیمان و موزیك. پەیکەری ئیمان پێی وابوو مەرج نییە هەموو نوێژکەرێك ئیماندار بێ، بەڵام مەرجە هەموو ئیماندارێك نوێژکەر بێ. پەیکەری موزیك قەناعەتی بەوە هات کە مەرجە هەموو موزیکژەنێك ئیماندار بێ بەڵام مەرج نییە هەموو ئیماندارێك موزیك بژەنێ، خۆ بشزانێ باشتر.

پەیکەری ئیمان پێی وابوو خەڵکی وڵاتی شازلاند لەبەر سێ هۆکار نوێژ دەکەن: یەکەم، لە منداڵییەوە وەك داوونەریتێك لەسەری راهاتوون، تەنانەت ناشزانن واتاشی چییە. دووەم، هەیە لەترسی باوکی یان دایکی نوێژ دەکا، سێیەمیان هەیە لەبەر کۆمەڵگە و دەوروبەری نوێژ دەکا تا بڵێن بەخوا مرۆییێکی نوێژکەر و ساڵحە.

## ٥

پەیکەری ئیمان پێی وابوو نوێژکەرانی هەرسێ گرووپەکەی سەرەوە لە پەنای نوێژەکەیان هەرچی خوا پێی ناخۆشە و نەهی لێکردووە دەیکەن. بۆیە پێی وابوو ئیماندار بە مانای تەواوی وشەکە دەگمەنە لەم سەردەمەدا لە شازلاند. بەڕای پەیکەری ئیمان، ئیماندار واتە چاکەکار، دەم و داوێن و دەست پاك، نوێژکەر و روحانی و نورانی. بەڕای پەیکەری موزیك ئەوانەی نوێژیش ناکەن، هەندێکیان، لەبەر ئەوانەیە کە نوێژ دەکەن چونکە هێندە رەفتار و هەڵسوکەوتیان شەیتانئاسایە.

چەند هەنگاوێکیان مابوو بگەنە کولانەکە، پەیکەری ئیمان دەنگی هەڵبڕی و لە هاتنی هاوڕێیەکی نوێ ئاگەداری کردنەوە. کاتێ پەیکەرەکان ئەوەیان بیست هەر هەموویان لە تاقە ژوورەکە هاتنە دەرەوە و پێشوازییان لە پەیکەری موزیك کرد. پەیکەرەکان هێشتا نەیانناسی بوو، هەر لە سەروسیمایڕا، خۆشحاڵبوون بە هاتنی پەیکەری موزیك.

"براکانم، لەم گەڕەکە پیسەدا، مرۆییێکی پاکی وەك پەیکەری موزیکم دۆزییەوە،" پەیکەری ئیمان وای پێیان گوت.

هەر یەکە لە راستەخۆی خۆشحاڵی خۆی بۆ پەیکەری موزیك دەردەبڕی و بەخێرهاتنیان کرد. هەر یەکە ناوی خۆی بە پەیکەرە تازەکە گوت. پەیکەری موزیك کاتێ چاوی بە کەلوپەل، پەیکەرەکان و چەپەکە شەمچەییەکە کەوت، چەندان پرسیاری لەلا دروست بوو. یەکەمجار ویستی را بکات لە دەستی پەیکەرەکان لەبەرئەوەی کەمێك بە کەلوپەل و جێگەکەیان تاسا و شڵەژا. دواتر ویستی هەموو پرسیارەکان بەیەك جار ئاڕاستەی پەیکەرەکان بکا. بەڵام هیچیانی نەکرد و لەسەر چیچکان دانیشت. پەیکەرەکان، هەموویان، دەسخۆشی موزیکەکەیان لێ کرد و پێیان وابوو بەڕاستی پەیکەری موزیکە، هەر ئەوە شایەنی پەیکەرێك بێ بۆ موزیك.

## ٦

"ئەوە بەچییەوە خەریکن؟" دوای سوپاسکردنی پەیکەرەکان، پەیکەری موزیك بە دڵێکی راڕاوە پرسی.

"برام دووی سوورت بیستووە؟" پەیکەری جووڵە لێی پرسی.

پەیکەری موزیك خەندەیەکی کرد، پاشان کەمێك وەستا، ئەوجا دەستی کرد بە پێکەنین. پەیکەرەکانی تر تاسان و وایانزانی گاڵتەیان پێ دەکا. بەڵام پێش ئەوەی یەکێکیان قسە بکا، پەیکەری موزیك گوتی:

"بە پێکەنینم حەپەسان داگیرتان نەکا. لە ٢٠٠٧/٢/٢٢دا، هێزەکانی سەپاندنی یاسا لە گەڕەکی قارەمانەکان منیان دەسگیر کرد کاتێ موزیکم بۆ کۆمەڵێك گەنج دەژەنی. پێیان وابوو من داهێنەری دووی سوورم. ئێستە ئەوان بە نهێنی بەدوای داهێنەری دووی سووردا دەگەڕێن. بەنهێنی لەبەرئەوەی نایانەوێ کەسی زیاتر لەبارەی دووی سوورەوە بزانن، دەیانەوێ بە بێ دەنگی کۆتایی بەسەرچاوەکە بهێنن و وشکی بکەن. بەڵام دوای مانگێك لێپرسینەوە و هێنان و بردن، هیچ لە من شین نەبوو و ئازادیان کردم."

"خۆ لێیان نەدای؟" پەیکەری خۆشەویستی، دوای ئاهێك بۆ پەیکەری ڕواڵی برای، پرسی.

"لێدان لە زیندانەکانی ئەوانە وەك ئەوە وایە هەر بچی و دابنیشی و گلاسێك ئاوی ساردت لەبەردەم دابنێن. لێدان جۆرێکە لە پێشوازی لای ئەوان."

"ئەی دواتر چیت کرد؟" پەیکەری نووسین پرسی.

"ئەی تەماشای فایل و کونیەیان نەکردی؟" پەیکەری بازرگانی پرسی.

"بەڵێ فایلیان هێنامە دەرەوە، بەڵام لەبیریان کرد بیگەڕێننەوە شوێنی خۆی کە سندوقێکی ئاسنین بوو. منیش خستمە ناو گیرفانم."

"یانی فایلی خۆت دزی؟" پەیکەری جووڵە بە پەرۆشییەوە پرسی.

"بەڵێ، بۆ ئەوەی چی تر من پەیوەندیم بەوانەوە نەمێنێت. لامن داخێکی گەورەیە فایلت لای ئەوانە بێت. ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە بەموزیك دژایەتی دووی سوور و دارودەستەکەی دەکەم."

"بەخێر بێیت،" پەیکەرەکان پێکڕا دووبارە بەخێرهاتنیان کرد.

دواتر یەکێ لە شەمچەکانیان گڕ دا و لەو ناوە ون بوون.

## ١

گەورەترین ئاگر لە وڵاتی شازلاند کەوتەوە. ئەوە یەکەم جارە ئاگرێکی وەها بکەوێتەوە. تەواوی هێزەکانی سەپاندنی یاسا بە هەموو لیواکانی ئاگرکوژێنەوەش گەیشتنە گەڕەکی قارەمانەکان کە جگە لە کاری خراپ و قێزەوەن شتێکی تری لێ نەدەکرا. زیانێکی زۆری گیانی و مادی لێکەوتەوە. گەڕەکەکە بە قەسابخانەیەکی سووتاو دەچوو. دووکەڵ و بۆنی مرۆی سووتاو تەواوی وڵاتی کاس کرد. کارەساتەکە لە شاشەگەل پەخش نەکرا تا کارە قێزەوەنەکانی کاربەدەستان و بازرگانان ئاشکرا نەبن.

هێزەکانی تەناهی کەوتنە گەڕ و گەڕان بەدوای بکەرانی ئاگرە گەورەکە. دوای چەندان مانگ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو بەڵگانەی پەیکەرەکان لە دوای خۆیاندا بەجێیان هێشتبوون، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەمانەی خوارەوە دەستیان هەبووە لە ئاگرە گەورەکە: پەیکەری سامانی رەش، پەیکەری پۆز، پەیکەری تف، پەیکەری تەندەر، پەیکەری مەرگ و پەیکەری بازرگانیی چڵێس و پەیکەری ئاگر.

گەڕان فایلەکانیان دۆزینەوە. فایلەکانیان هێندە پیس و ناشرین

بوو هەموو پێکڕا پەیکەرێکی ناشرینیان لە فایل دروست کرد بوو. فایلی ئەو پەیکەرانە مایەی شەرمەزاریی وڵاتە. سەیر ئەوەیە کەس لێیان ناپێچێتەوە، تەنانەت دووی سوریش ڕۆژێك لە ڕۆژان هەڵوێست بەرامبەریان وەرناگرێ.

٢

## فایلی پەیکەری سامانی رەش

ناو: پەیکەری سامانی رەش

شوێنی لەدایکبوون: شاری مەستی

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٩

کارزانی: ئاودیوکەرێکی نەقۆڵای سامانی رەشە

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش ناڕێك و سەقەت

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم

بیرکردنەوە: پووچ و بێ خێر

دروشم: تا سامانی رەش هەبێ منیش هەم

بۆچوونی لەسەر گەل: گەل تا نەزانتر بێ باشترە

رابردووی: منداڵێکی چڵمن و گیرفانبڕ

٣

# فایلی پەیکەری پۆز

ناو: پەیکەری پۆز

شوێنی لەدایکبوون: شاری مەستی

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٨

کارزانی: پۆزلێدان بە پارەی گەل

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش نارێك و سەقەت.

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیرکردنەوە: کا

دروشم: کەس لە من پیاوتر نییە

بۆچوونی لەسەر گەل: گەل قۆندەرەیە

رابردووی: کاسەلێسی دوژمن

٤

## فايلی پەیكەری تف

ناو: پەیكەری تف

شوێنی لەدایكبوون: شاری مەنگ

پلەی كار: كاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی كاری: وەزارەتی نەزانی ١٧

كارزانی: تف لێكران و تفكردن لە خەڵكی

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش ناڕێك و سەقەت.

سیفەتەكانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیركردنەوە: زفت

دروشم: بە تف بژی

بۆچوونی لەسەر گەل: تف لە گەل

رابردووی: تف باران كرا

## ٥

## فایلی پەیکەری تەندەر

ناو: پەیکەری تەندەر

شوێنی لەدایکبوون: شاری زیندووان

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٦

کارزانی: لێدانی تەندەر

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش ناڕێك و سەقەت.

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیرکردنەوە: شەو و ڕۆژ تەندەر

دروشم: تەنێ تەندەری پڕۆژەی زەبەلاح

بۆچوونی لەسەر گەل: با گەل قەت لە تەندەر تێنەگا

رابردووی: دزی

٦

## فایلی پەیکەری مەرگ

ناو: پەیکەری مەرگ

شوێنی لەدایکبوون: شاری زیندووان

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٥

کارزانی: فرۆشتنی مەرگ

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش نارێك و سەقەت.

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیرکردنەوە: هەر مەرگ دەفرۆشم

دروشم: هەردەم بە مەرگی ئەوانی تر بژی

بۆچوونی لەسەر گەل: مەرگ بۆ گەل

رابردووی: سەرچاوەی مەرگی مەردان

٧

## فایلی پەیکەری بازرگانی چلێس

ناو: پەیکەری بازرگانی چلێس

شوێنی لەدایکبوون: شاری زیندووان

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٣

کارزانی: ساخکردنەوەی خۆراك و شتی تەندروستیی بەسەرچوو

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش نارێك و سەقەت.

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیرکردنەوە: بەیانی چۆن کارگۆکەم بهێنمە ناوەوە

دروشم: درۆ باجی نییە

بۆچوونی لەسەر گەل: گەل شایەنی کەلوپەلی بەسەرچووە

رابردووی: برسی و دەسندەخۆر

## ٨

## فایلی پەیکەری ئاگر

ناو: پەیکەری ئاگر

شوێنی لەدایکبوون: شاری زیندووان

پلەی کار: کاربەدەستی نهێنی بە پلەی باڵا

شوێنی کاری: وەزارەتی نەزانی ١٢

کارزانی: سووتاندنی پاڵەوانان

شێوەی: خڕ، قەڵەو، ئەسلەح، لەش نارێك و سەقەت.

سیفەتەکانی: بێ ئەمەك، بێ ئینتیما، نەزان، بێباك، بێ شەرم، زۆرخۆر

بیرکردنەوە: کێ پاڵەوانە بیسوتێنم

دروشم: پاڵەوان هەبێ من نیم

بۆچوونی لەسەر گەل: گەل بۆ سووتاندن باشە

رابردووی: جاش

## ٩

کاربەدەستان بێ دەنگیان کرد لە ئاگرە گەورەکە و خێرا شوێنەکەیان پاك کردەوە بۆ ئەوەی کەس نەزانێ ئەو گەڕەکە هەر هەشبووە! لە ماوەی تەنیا ٢٤ سەعاتدا چوار سەت خانوویان لەوێ دروست کردەوە بۆ ئەوەی کاربەدەستان و بازرگانەکان لە رابواردنیان نەبن.

پەیکەرەکان، نووسین، بازرگانی، ئیمان، موزیك، خۆشەویستی، جووڵە و خەم دوای ئەوەی گەڕەکی قارەمانەکانیان بەجێ هێشت، کۆمەڵێك بەڵگەیان لە دوای خۆیاندا بەجێ هێشت کە ئاماژە بوو بەو پەیکەرانەی کە فایلەکانیان کرانەوە.

# ١

چاوی پڕ لە فرمێسك، هەناسەسوار، پێنگاوەکانی خێرا وەك ئەسپی تاودراو، جارجار ئاوڕێکی دواوەی دەدایەوە و جارجاریش ئەملاو ئەولا، شێواو و ترساو، بەرەو شوێنی مەبەست بە نیوەی شەو وەڕێکەوت. شەقام و کۆڵانەکان تژی بوون لە هێزەیلی سەپاندنی یاسا. هەر هەموو یەکە و بەشەکان جلی رەشیان لەبەردا بوو، دەمامکدراو وەك نینجا، بەڵام نینجایەکی عادی. بەشێکی تۆقینی خەڵکی شازلاند لە هێزەیلی سەپاندنی یاسا لەبەر ئەو جلە رەش و دەمامکانە بوو. نەزانی و ناپیشەییانەشیان بە جاریێ خەڵکی هەراسان دەکرد. بە هەر تۆمەت و کەیسێك یەکێك دەسگیر بکەن، جاریێ ماوەی شەش مانگ بۆ ساڵێك لە زیندانە نهێنییەکان دایدەڕزێنن. هەموو جۆرە شەڕێکی دەروونی لەگەڵدا دەکەن، هەموو جۆرە شێوازێکی ئەشکەنجەدانی لەسەر تاقی دەکەنەوە. جا هەیە تاوانەکەشی نەکرد بێ هەدای نامێنێ و دوای ماوەیەك لە ژێر ئەشکەنجەدان دان بە هەموو شتێك دادەنێ.

## ٢

بە دزەدزە، وێڕای ترس و دڵەڕاوکێ، پەیکەری خۆشەویستی خۆی گەیاندە ماڵی پەیکەری جووڵە. رمب رمب لە دەرگەی دا. دوای کەمێك چاوەڕێکردن، پەیکەری جووڵە دەرگەکەی کردەوە. لەگەڵ کرانەوەی دەرگە پەیکەری خۆشەویستی توووند خۆی بە باوەشی پەیکەری جووڵە دادا. ئەویش بەو باوەشە کتوپڕە لەم نیوە شەوەدا هێندەی نەما زەندەقی بچێ. پاشان هاتەوە سەرە خۆی و توووند پەیکەری خۆشەویستی گوشی. هەر لە حەوشەدا بەشێوەیەك دەمیان خستە ناو دەمی یەکتر وەك بڵێی تەمەنێکە ماچیان نەکرد بێ. مژینی لێو و زمانی یەکتر و لێستنەوەی ددان خەریك بوو لە دنیای راستەقینە ونیان بکات. پاشان پەیکەری جووڵە بە پەرۆشەوە پەیکەری خۆشەویستی خستە سەر شانی و بردییە تاقە ژوورەکەی. بۆ ماوەی نیو سەعات سەدای ئاخ و ئۆف و هانکەهانك گوێی نینجا عادییەکانی کەڕ کرد.

پاش کەمێك بێ دەنگی و راموسان، پەیکەری جووڵە هاتە حەوشەکە، چاوەکانی لێکنا و هەوایەکی پاکی هەڵمژی. دەنگێك لە دواوە نەیهێشت هەناسەی دووەم وەرگرێ.

"پلانەکان تەواو بوون؟" پەیکەری خۆشەویستی بە دەنگێکی نەرم و هێمن وای گوت.

"بەڵێ،" پەیکەری جووڵە چووە لای و دەستی لە ملی کرد و دواتر بەردەوام بوو: "کاتی هاتووە جێبەجێیان بکەین."

"من ئامادەم!"

## ٣

هەردوو پەیکەر خۆیان ئامادە کرد و چوون بۆ لای پەیکەرەکانی تر. هەموویان لە گەڕەکی سامداران کولانەیەکی تریان لە شەمچە دروست کرد. ئەمجارە تەواوێك گەورەتر بوو لەوانەی پێشوو: شەش بە پێنج. لە ناوەڕاستی کولانەکە هەموو دەستیان لە ناو دەستی یەکتر دانا و هەر یەکە لە دڵی خۆی نزای کرد لە جێبەجێکردنی پلانەکان سەر بکەون. لە ناکاو دەنگێکی بوێر و دڕ پەیکەرەکانی لە نزاکرن پچڕاند.

"ئێمەش پێك دەکەن؟"

پەیکەرەکان لە نزاکرن نەوەستان. هەردوو پەیکەرە نوێیەکە بۆ ماوەیەك وەستان تا پەیکەرەکان لە نزاکرن تەواو بوون.

"ئێوە کێن؟" پەیکەری جووڵە لێیان چووە پێش و پرسی.

"من پەیکەری ترسم،" یەکێکیان بەدەنگێکی بوێر و نەترس وای گوت، پاشان بەردەوام بوو: "من پێشتر خزمەتی پەیکەری شەرمەزاریم کردووە لە شاری مەستی."

ئەوی تریش گەرووی ساف کرد و گوتی: "منیش پەیکەری بێدەسەڵاتیم، هەموو ژیانم خزمەتی پەیکەری نەفسم کرد."

پەیکەری خەم، کاتی خۆی زۆر داخ و خەفەتی لە بەسەرهاتی هەردوو پەیکەرەکە خوارد بەتایبەتی پەیکەری بێدەسەڵاتی، بۆیە تاوی دایە هەردوو پەیکەر و دەستی کردە ملیانەوە. پەیکەرەکانی تریش هەمووی خۆیان بەسەر هەرسێ پەیکەری ترس، خەم و بێدەسەڵاتی دادا. ئەم دیمەنە لە دوورەوە بە پەیکەری گردی پەیکەران دەچوو. پەیکەری خەم کەوتبووە بنی بنەوە، هێندەی نەما بوو بخنکێ. هاواری کرد هەستنەوە و بەسی کەن. پەیکەرەکان زانیان وەزعی باش نییە هەستانەوە.

## ٤

"با ئەمشەو بکەینە شەوی چێژوەرگرتن لە ئەدەب و موزیک و سەمای دەروێشانە،" بەهەناسەبڕکێوە پەیکەری خەم وای گوت، یەك دوو پیشی خواردەوە و بەردەوام بوو: "هەموو شتێك ئامادەیە، بەیانی هەموو شتێك جێبەجێ دەکەین. بەڵام با ئەمشەو هەموو شتێك لە بیر بکەین و کەمێك تام لە ژیان بکەین."

"زۆر باشە من بە چەند کورتیلە چیرۆکێك دەست پێدەکەم،" پەیکەری نووسین وای گوت، " تکایە گوێ بگرن لە هونەری نووسین و تام لە چەشەی ئەدەبی وەرگرن."

هەموو پەیکەرەکان، هەر یەکە چوارمەشقی لە شوێنی خۆی دانیشت و چاوەڕێی دەمی پەیکەری نوسینیان دەکرد. کورتیلە چیرۆکی یەکەم لەبارەی سواڵکەر و زەنگینەکانە.

## ٥

## کورتیلە چیرۆکی یەکەم

*"لە دڵی خۆیدا یەکێکی بەشان و شەوکەتی لە ئاپۆرەکەدا هەڵبژارد تا سواڵی بیست و پێنج سەنتییێکی لێ بکات. کابرا شیك و پۆشتە، شای نەدەکردە سەپانی خۆی. لە دوورەوە بەخوادەیەك دەچوو هەموو کەس تێر بکات.*

*سواڵکەری جل داڕزاو، سەر و پۆتەلاك گلێش و برش، لاواز و زەلیل. لە کابرای پۆشتە نێزیك بووەوە، لە پشتەوە بەدەستی پڕ قرێژ و دەماردیارەوە کابرای پساند لە ئاپۆرەکە و پێی گوت:*

***چیت لە دەست دەبێتەوە خێرە بۆ تۆ و هاوکارییە بۆ من.***

*کابرا سوور هەڵگەڕا، شەرمنانە سەیری چاوە تەماوییەکانی سواڵکەری کرد. دڵڕەقانە پێی گوت "خوا بدە!"*

پەیکەرەکان دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان، هەر یەکە لە شوێنی خۆی دەستخۆشی لێکرد و گوتیان بەڕاستی نموونەی ئەدەب و فەلسەفەی نووسینە. پەیکەری نووسین چووە سەر چیرۆکی دووەم کە باس لە دیمەنێکی بێ وێنە دەکا:

## ٦

## كورتیله چیرۆكی دووەم

*"بیانییەك عەشقی بووبوو. عەشقی باڵابەرزێكی چاوكاڵ، تەنك تەنك، سوورئاڵ، باریكەلەی لێو بەبار بووبوو." ئەگەر ببێتە هی من دەست لە وڵاتی خۆم هەڵدەگرم و لێرە دادەكوتم. لە دینی خۆم وەردەگەڕێم و دەچمە سەر هی ئەو "بیانییەكە بەحەسرەتەوە وای گوت.*

*"تۆ ئامادەی ئەو هەموو قوربانییە بۆ ئەو جوانكیلە بدەی، منیش بەڵێن بێ یارمەتیت بدەم "بە بیانییەكەم گوت. دوای سووڕانەوەی هەفتەیەك، من و بیانییە تامەزرۆكە لێك دابڕاین. دوای سووڕانەوەی چەند هەفتەیەكی تر، خۆم عەشقی ئەو باڵابەرزە چاوكاڵ، تەنك تەنك، سوورئاڵ، باریكەلە لێو بەبارە بووم.*

*دوای سووڕانەوەی سێ هێندە هەفتەی تر بەبیرەبیر و دڵەراوكەوە لەسەر تەلەفۆن لە دووری سەت مەترێكەوە پێم گوت "من تۆم خۆش دەوێ" . كراسێكی سوور، جینێكی شین، كاڵەیەكی سپی لەبەردا بوو. لە ئاست ئەم داوایە لێوی كرۆشت، هەستم كرد سوور هەڵگەڕا و بۆ ماوەی دوو خولەك لەو دوورەوە بەگومانەوە*

سەیری دەکردم.

"دەزانم قورسە، بیری لێ بکەوە. من ئامادەم ساڵێك، دووان و شەش ساڵ بوەستم "پێم گوت. تەلەفۆنەکەی لەسەرم داخست، رووی وەرگێڕا و ون بوو لەبەر چاوم. چوار هێندە هەفتەی تر سووڕایەوە.

"بڕیارت نەدا؟ "لەسەر تەلەفۆن پێم گوت." تۆ نەتگوت ئامادەی شەش ساڵ بوەستی "بەهەستێکی تێکەڵاوەوە وەڵامی دامەوە. "راستە، بەس مەبەستم ئەوە نەبوو لەسەر سك رامبکێشی " بەدڵێکی خەمبار و بێ فیز وام پێ گوت.

٧

کورتیلە چیرۆکی سێیەم باسی لەو منداڵانە کرد کە بۆ یەکەم جار دەبرێنە باخچەی ساوایان:

*"بردمە ناو زەمیلە پڕ لە تۆپەکە. بەحسێبی خۆم بردوومەتە بەهەشت. خۆم لێدزییەوە و چووم بۆ کار. تا هاتمە دەرەوە لە دانیگەکە هێندەی گوت "بابە"، کەوێکم هاتە بەرچاو لە قەفەسێکدا. هەر "بابە"یەکی ئەو بەجارێ دڵی ڕاو دەکردم. تفی حەژمەتم قووت دایەوە و لێمدا ڕۆیشتم.*

*ژوورەکانی تر بەدوامدا گەڕا، تا دوایەمین ژوور هەر هیوای مابوو من دەدۆزێتەوە. دوای ئەو ژوورەش هیوای بڕا و دەستی کرد بەگریان. هێند گریا تا تەنگەی بەژان کەوت، هێند گریا تا بڕستی لێ بڕاو و خەو بۆ خۆی بردییەوە. نێزیکی سەعات دوو چووم بەدوایدا. وەك بولبولی بەیانییە درۆزنە ئەو ژوور و ئەو ژوورم کرد و خوێندم : لۆهان لۆهان لۆهان...*

*دوایەمین ژوور هیوای پێ بەخشیمەوە. دەرگام کردەوە. بینیم خەمدانی پڕ بووە و خەریکە دەتەقێ. هەستم کرد ژانێکی قووڵ لە*

دەروونیدا گینگڵ دەدا. لەو قەفەسەدا کەوێك بوو بێ دایباب. بەدیار بەخێوکەرەکەوە، هەردووکیان وەك دڕندەیەك و نێچیرێکی بەستەزمان دەهاتنە بەرچاوم.

کە منی بینی هێند لێم وورد بووەوە تا ناسیمیەوە وەك بڵێی دوو ساڵی رووناکی لێی دوور کەوتبێتمەوە. لچێکی گریان و لچەکەی تر پڕ پێکەنین. سەری سڕمابوو "ئاخۆ من بێدارم یان ئەمە خەونە باوکم دەبینم ."

ئەو دەمەی چاتر منی ناسییەوە قرقەپی شکاند "بابە... بابە " دەستی بەگریانێکی هێمن کرد."

٨

پەیکەرەکان دەستخۆشییان لە پەیکەری نووسین کرد و هیوایان خواست بێ بەشییان نەکا لەو چیرۆکە بەپێز و سیحراوییانە.

دواتر پەیکەری موزیك سازەکەی لە جانتا دەرهێنا، پرێسکەکەی لە شانی کردەوە و لە تەنیشتییەوە داینا و دەستی بە ژەنین کرد. ئاوازێکی تازە، سەرخۆشکەر و بێوێنەی ژەنی. پاشان ئاوازێکی کەمێك خێرا، وای لە هەموو پەیکەرەکان کرد بکەونە جووڵە و سەمای دەروێشانە. ئەم دیمەنە لە دوورەوە بە پەیکەری سەما دەچوو.

"چما ئیمانداریش سەما دەکا،" پەیکەری بازرگانی بەدەم سەماوە بە پەیکەری ئیمانی گوت.

"ئەمە سەمای روحە." پەیکەری ئیمان وەڵامی دایەوە.

## ٩

هەوالێك پەیکەرەکانی لەو خۆشییە، لەو دواهەمین ساتی سەما و موزیك و روحانیەتە پچڕاند. دیمەنی خۆشی تەواو ئاوەژوو کردەوە. دوای ئەوەی بەپەلە و لەهیکرِا خۆی بە کولانەکەدا کرد، بەهەناسەبڕکێوە گوتی: "بوەستن، بوەستن."

هەموویان وەك بلێی لەو دەمەدا بووبن بە بەرد، هەریەکە لە شوێنی خۆی لە هەمان ئەو جوولەیەی سەرگەرمی بوو وەستا.

"براکەتیان کوشت،" بەدەنگێکی خەمئامێزەوە، دوای ئەوەی رووی لە پەیکەری خۆشەویستی کرد، وای گوت.

پەیکەری خۆشەویستی، چاونماوی و تژی لە خەمیژگە و کەسەر، رۆندکی باراند.

## ١

گرووپێك نینجای عادی هاتن هەموو کتێبەکانی ناو کتێبخانەی گەڕەکی (بێسەروشوێنان)یان کۆکردەوە. لە شوێنێکی بەرزی گەڕەکەکە هەموویان بەسەریەکدا خڕ کردەوە. دواتر بە بەرچاوی خەڵکەکە بەنزینیان پێدا کرد و ئاگریان تێبەر دا. ئاگرێك دایسا تەنانەت فرمێسکی خەڵکەکەش، کە جۆگەلەیان بەست بوو، نەیتوانی ئاگرەکە بکوژێنێتەوە. لەباتی ئەو کتێبانە، یەك ترێلە کتێبیان هێنا خستیان ناو کتێبخانەکە. هەر هەموو کتێبەکان یەك بەرگ و یەك بابەت بوون: باسی لە پیرۆزی دەسەڵاتی سەرۆکی وڵات دەکرد. یەك ترێلە لە تیراژی ئەم کتێبەیان لە ناو کتێبخانەکەدا دانا.

کۆلەوارکردن، کوێرکردن و سووککردنی گەل سێ کار بوون لەو کارانەی کە کاربەدەستانی وڵاتی شازلاند زۆر لێی شارەزا بوون و بڕوانامەی دکتۆرایان لێ هەبوو.

٢

چەند ساڵێك لەمەوبەر دووی سوور بڕیاری دا ئەوەی خوێنەرە دەبێ بێتە دەسگیرکرن و ماوەی شەش مانگ لە زیندان کۆرسی لەبیرچوونەوەی کتێبیان بۆ بکرێتەوە. کاربەدەستانی ئەم وڵاتە هێندەی لە کتێب و خوێنەرانی گەلی خۆیان دەترسن هێندە لە دوژمنانی سەرسەختی خۆیان ناترسن کە دراوسێن و هەر رۆژە و پیلانێکیان بۆ دەگێڕن. هەموو کەس چیرۆکی پەیکەری خوێندنەوە دەزانێ کاتێ لە کۆرسی لەبیرچوونەوەی کتێب هەڵات. دواتر گرتیان و بە کتێب لە ناوەڕاستی شاری مەستی بە بەرچاوی گەنجان خنکاندیان.

٣

له چەند قۆناخێکی جیاجیادا سەتان کەس لەو گەڕەکەدا لەلایەن هێزەیلی سەپاندنی یاساوە بە هۆی جیاجیا بزر کراون و تا ئێستەش بێسەروشوێنن. لەبەرئەوەی خەڵکەکە ناویان ناوە گەڕەکی بێسەروشوێنان. حکوومەت هیچ بایەخێك لە رووی دابینکرنی بچووکترین و سەرەتاییترین خزمەت بەو گەڕەکە نادا. بۆیە گەڕەکێکی پیس، بێ ئاو، بێ کارەبا، قیرتاونەکراوە. کەلاوەییێکە، ژیانی لێ دەرچێ، شوێنی هەموو شتێکە. بەڵام خەڵکەکە خۆیان لە ناوەڕاستی گەڕەکەکە، وێڕای ئەو هەموو نەهامەتییە، کتێبخانەیەکیان لەسەر ئەرکی خۆیان دروست کرد و پڕیان کرد بوو لە کتێب.

## ٤

له ٢٠٢٠/٢/٢٢دا، له هه‌مان گه‌ڕه‌ك هه‌ر یه‌ك له پـه‌یکه‌ره‌کان، جووڵه، بازرگانی، ئیمان، نووسین، خۆشه‌ویستی، بێده‌سه‌ڵاتی، خه‌م، ترس و موزیك جلێکی سپییان پۆشی. به سووری له نێوچه‌وانیاندا نووسیان: بۆ گه‌ل، بۆ وڵات.

دوای دابه‌شکردنی کاره‌کان له کۆبوونه‌وه‌یه‌کی خێرا ، یه‌کێك له‌و ده‌نکه شه‌مچانه‌ی که چه‌په‌کیان پێ دروست کرد بوو ئاگر دا و ڕۆیشتن.

پـه‌یکه‌ری ترس و پـه‌یکه‌ری بێده‌سه‌ڵاتی و پـه‌یکه‌ری خه‌م چوونه شاری مه‌نگ. پـه‌یکه‌ری نووسین و موزیك و ئیمان چوونه شاری مه‌ستی و پـه‌یکه‌ری جووڵه و خۆشه‌ویستی و بازرگانی هه‌ر له شاری زیندووان مانه‌وه.

## ٥

شەوی بووری، دوای سەمای روحانی و کەیفخۆشی، هەموان سوێندیان خوارد لە پێناو گەل و وڵات پلانەکان جێبەجێ بکەن. هەمویان پێکڕا رێگەیەکیان دۆزییەوە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکان بێ ئەوەی کەس بیانبینێ یان هەستیان پێ بکا. رێگەکەش ئەوە بوو: هەریەك لەسەر پشتە دەستی راستی بەداغکردن نووسیان: "من هێرم". ئەوەی "من هێرم"ی لەسەر پشتە دەستی لای راست نووسرابا لە وڵاتی شازلاند ئەوا بۆی هەبوو بچێتە هەموو شوێنێك بێ ئەوەی کەس، تەنانەت دارودەستە و نینجا عادییەکانی دەستەی گومانیش نەیاندەتوانی رێیان لێ بگرن.

هێرِ لەم وڵاتەدا بێ ترس دەچووە ناو کۆشککەلی کاربەدەستان، دەیانتوانی سەیران بکەن لە ناوچەی "فڕین" کە خۆشترین سەیرانگەی ئەم وڵاتەیە و کاربەدەستان داگیریان کردووە. کەس بۆی نەبوو، نەك بچێتە ناوی، تەنانەت لێشی نزیك بێتەوە. بەڵام هێرەکان دەیانتوانی. ئەو هێرانە وەك هاوڵاتی پلە سێن. پلە یەك کاربەدەستان، پلە دوو دارودەستە و چەلاوخۆرەکانن. خەڵکی ئاسایی، کە هەردەم بەرەشوڕووت ناسراون، پلە چوارن.

هەموو کەسێك وەها ئاسان نابێتە پلە دوو و پلە سێ لە شازلاند. پلە دوو دەبێ ئەم سیفەتانەی تێدا بێ: خەسێنراو، مێشك شوراو، بیرکۆر، بەزێنراو، تێکشکێنراو، سەرشۆڕ و گەمژە. پلە سێ ئەوانەن کە بەهۆیەك لە هۆیەکان گیراون و بە کۆڕسی دوو ساڵەی هێڕبووندا ڕۆیشتوون و دەستیان هەڵگرتووە لە خەون و مەبدەئی ژیانیان. تۆبەیان کردووە لەوەی هیچ نەڵێن و هیچ نەکەن.

## ٥

دوێنێ شەو دوای ئەوەی پەیکەرەکان بەهۆی هەواڵی مردنی برای پەیکەری خۆشەویستی وەستان لە سەما، پەیکەری موزیك و پەیکەری ئیمان چوونە سەر کێوی باڵ. لەوێ تا بەرەبەیان قسەیان لەگەڵ پەیکەری باڵ کرد کە هەڵۆییێکی تیژباڵ ، سەرۆکی هەموو هەڵۆیەکانی شازلاند بوو. داوایان لێ کرد لە جێبەجێکردنی پلانەکان هاوکارییان بکا. پەیکەری باڵ رازی نەدەبوو لەبەرئەوەی کاتی خۆی لە شەڕێکی ناوخۆدا لە شازلاند، لە نێوان دوو عەشیرەتی گەورەدا، هەرچی هەڵۆ هەبوو لەو شەڕەدا لە کێوەکان لەناو چوون. جووتێکیان نەبێ، پەیکەری باڵ و خۆشەویستەکەی، ئەوانی تر هەموویان بەر تۆپ و هاوەن و گوللە کەوتن و مردن. ئەوە چەند ساڵێکە پەیکەری باڵ گەڕاوەتەوە و دووبارە خێزانی هەڵۆکانی لەم وڵاتەدا ژیاندەوە. بۆیە دەترسا لەوەی جارێکی تر شەڕ هەڵگیرسێتەوە و لەناو بچن.

"باوی شەڕ نەماوە،" پەیکەری ئیمان بەدەنگێکی روحانی وای گوت، "ئێمە بەڵێنت پێ دەدەین کە هیچ زیان بە ئێوە نەگات."

"بۆچی دەتانەوێ ئەو کارە بکەن؟" پەیکەری باڵ پرسی.

"دەمانەوێ وڵات لەسەر بنەمایەکی راست دروست بێ، دەمانەوێ پلەبەندی نەمێنێ و دادپەروەری بەرقەرار بێ،" پەیکەری موزیک وای گوت.

٦

پەیکەری جوولّە، خۆشەویستی و بازرگانی لە شاری زیندووان چوونە هوتێلی ئاوی لینج کە دەکەوێتە هەرە جەنجالّترین شوێن لە چەقی شارەکە. ئاوی لینج شوێنی بیانی و پلە یەك و دووەکانی شازلاندە. بەرزترین و راقیترین و گرانبەهاترین هوتێلی شارەکەیە کە کەمترین نرخ بۆ ژوورێکی یەك نەفەری دەگاتە ٢ هەزار دۆلار. بەردەمی ئاوی لینج هەردەم تژییە لە هێزەیلی چەکدار و نینجای عادی. رەوشی تەناهی لەویٚ زۆر توند و بەهێزە. لە پرسگە یەکسەر دەستی راستیان پێشان دا و بیٚ ئەوەی کەس بپرسیٚ بۆ کویٚ دەچن یەکسەر چوونە ژوورەوە. سواری ئاسانسەر بوون لە قاتی ٢٢وەمین دابەزین، ئەوجا بە پەیژە چوونە سەری سەرەوەی هوتێلەکە. لەویٚ کەمێك چاوەڕێیان کرد.

هێندەی پیٚ نەچوو سیٚ هەلّۆی رەشی مل سپی لایان نیشتنەوە.

## ٧

هەریەك لە پەیکەرەکان دوو گونیە و سێ تیر و کەوان و یەك جانتا گەورە نامەی پێ بوو. دوو گونیەکە پڕ بوون لە کاغەزی بچووك بچووك کە لەسەریان نووسرا بوو: هەمووی خەتای دووی سوور و دەستەکەیەتی. نامەکانی ناو جانتا گەورەکەش پەیامی پەیکەرەکانی تێدا نووسرا بوو:

***"با سەرانی وڵات وڵاتیان لە هەموو شتێك خۆشتر بوێ. با نیشتمانپەروەر بن، با مەفتەنیان خۆش بوێ و واز لە بەرژەوەندیی کەسانی و خێزانی بێنن."***

هەر سێ پەیکەر دەستیان دایە تیروکەوان. جانتاکەیان کردەوە. ئیتر بە تیر هەموو نامەکانیان لە ناو شاردا بڵاو کردەوە. هەر تیرە و نامەیەکی پێوە بوو کە دەیانگرتە شوێنێکی جەنجاڵ و گشتی شارەکە. پاشان زۆر بەخێرایی هەر شەش گونیە پەڕاوە بچووکەکانیان لەسەر هوتێلەکە بەناو شەقام و کۆڵان و بازاڕ بەگۆڕێ کرد.

دوای چەند ساتێك، لە شاری زیندووان کاغەز دەباری. ماڵ نەبوو کۆمەڵێك کاغەزی بەر نەکەوێ، کەس نەبوو کاغەزێکی نەکەوێتە

سەر شانی. بازاڕ پڕ بوو لە کاغەز، شوێنە گشتی و جەنجاڵەکان، پارکەکان هەر هەمووی پڕ بوو لە کاغەز، شوێنی سەرەکی و گشتی نەما تیرێکی بە نامەی پێوە نەبێ. خەڵکی، وەك بڵێی دۆلار باری بێ، ئاوا بەپەرۆشەوە کاغەزەکانیان هەڵدەگرتەوە و تەماشایان دەکرد. وەك بڵێی فریشتەی با لەگەڵیان بێ، هیچ پەڕە کاغەزێك لەسەر زەوی نەدەکەوت. ئەوەی لەلایەن خەڵکی هەڵدەگیرایەوە هەڵدەگیرایەوە، ئەوەی تریش نەدەکەوتە سەر زەوی یەکسەر بایەکە دەیبردە سەرەوە و دەیباراندەوە.

## ٧

سەرەتا خەڵك تاسا، شێوا و دەترسا. زانیان ئەمە كارێكە مەترسیدار. زانیان ئەوانەی لە پشتی ئەمەن یاری بە ئاگر و چارەنووسی خۆیان دەكەن. بەڵام دواتر لەبەرئەوەی هەموو كاغەزێكی بەدەستەوە بوو، ئەو تەماشای ئەوی دەكرد و ئەمیش ئەو، گەل هێزێكی بۆ دروست بوو. بۆ یەكەم جار هەستیان كرد هێزێك هەیە لە ژوورەوە پاڵیان پێوە دەنێ تەلبەندی بێ دەنگی بشكێنن و ئەوەی چەند ساڵە لە ژوورەوە بەندیان كردووە ئازادانە و بوێرانە دەریببڕن.

هەر لە هەمان كاتدا، پەیكەری ترس و بێدەسەڵاتی و خەم لە شاری مەنگ، لەسەر بەرزترین باڵەخانە، توانیان چوار گونیە پەڕاوی بچووك لەگەڵ سەتان نامە بەسەر شارەكەدا ببارێنن. خەڵكی ئەوێ، زۆربەیان هێڕ، بەقەد شاری زیندووان بەپەرۆش نەبوون بۆ بارینی كاغەز. بەڵام ئەمە دەستپێك بوو بۆ هەژاندنی ناخ و دڵیان، بۆ واگاهاتنەوەیان لەوەی كە وڵاتی شازلاند لە چ قەیرانێك دایە. شاری مەنگ هەردەم بەوە ناسراوە كە تێیدا نە بای دێ و نە باران. شارێكی دوورەدەست و گۆشەگیر. لەوێ، وەك شاری

زیندووان و مەستی نییە، خەڵك خەریكی ژیانی خۆیانن و هێندە خۆیان بە سیاسەت و ئەو شتانە سەرقاڵ ناكەن.

## ٨

پەیکەری ئیمان، نووسین و موزیك، بەهەمان شێوەی پەیکەرەکانی تر، چوونە سەر تاکە بورجی شاری مەستی کە بەرزترین بورجە لە تەواوی ناوچەکەدا. لەسەری سەرەوە شەش گونیە کاغەز و سەتان نامەیان دابارانده سەر شارەکە. دەتگوت کەرنەڤالّی کاغەز بارینە. خەڵك بەمە زۆر خۆشحاڵبوون، وەك بڵێی دەمێك بوو چاوەڕێی ڕووداوێکی لەم جۆرە بکەن. یانیش لەبەرئەوە بوو کە کاتی خۆی گردبوونەوە و ناڕەزاییان دەربڕی، بەڵام هێندەی نەخایاند نینجا عادییەکان دەیان کەسیان لێ کوشتن و سەرکوتریان کردن. بۆ خەڵکی شاری مەستی ئەمە بوژاندنەوەی ناخ و زیندووکردنەوەی غیرەت بوو. خەڵکی پێکرا لەگەڵ کاغەزەکان سەمایان دەکرد.

## ٩

لە تەواوی شازلاند، لە هەموو کوچە و کۆڵان و کونجێکدا، کاغەز دەباری. گەورەترین پرۆسەی هۆشیارکردنەوە بوو. شۆڕشێکی نوێ بوو. پەیکەرەکان سواری پشتی هەڵۆیەکان بوون و هەموو لە دارستانی بوێری یەکتریان بینییەوە. لەوێ، پەیکەرەکان رێز و سوپاسی خۆیان بۆ پەیکەری باڵ دەربڕی و ئەویش خۆی و هەڵۆکانی گەڕانەوە سەر کێوی باڵ. پەیکەرەکان پیرۆزباییان لە یەکتر کرد و زۆر دڵخۆشبوون بەوەی کارەکەیان سەری گرت.

"تۆ بڵێی هێڕەکان هەستیان ببزوێ و بێنەوە سەر خۆیان؟" پەیکەری خۆشەویستی پرسی.

"تۆ بڵێی نینجا عادییەکان نەکەونە بەر گیانی خەڵکی؟" پەیکەری خەم پرسی.

پەیکەرەکان بەدەیان پرسیاری لەو جۆرەیان کرد. چاوەڕێی بەرتەکی هێزەیل و نینجای عادی و کاربەدەستانیان دەکرد.

"برایان، با هەر یەك لە ئێمە بگەڕێتەوە ماڵی خۆی چونکە ئەگەر بزانن ئێمە بزرین لە شار ئەوا دەزانن ئێمەین،" پەیکەری جووڵە وای گوت.

"پێش ئەوەی بڕۆین با روحمان بە تازە موزیکێك شاد بکەین،" پەیکەری ئیمان وای گوت.

هەموان تەماشای پەیکەری موزیکیان کرد، ئەویش سازەکەی دەرهێنا و دەستی بە ژەنین کرد. ئاوازێك بوو نەمر. ئاوازێك کە هەموو لك، پۆپ، گەڵا و درەختی دارستانی بوێری هێنا هاژە و سەما.

# ١

دەسڕەکەی پەیکەری گومان چڵکن و بۆر بوو بوو هێندەی ئارەقی نێوچەوانی بسڕێتەوە. تکەتکی ئارەق، دوای سڕینەوە، بڵقیان دەکرد و بەدەیان زمان لەسەر روویان دەنووسی: "رك!" دەستەکانی گرمۆڵە دەکرد و توونـد بەمێزە گرانبەهاکەی بەردەمیدا دەکێشا. چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە. دواهەمین جار جامی سەر مێزەکەی وردوخاش کرد و دەستی برینـدار بوو. خێرا بانگی تیمی پزیشکی تایبەتی کرد. بروسکەئاسا کۆمەڵێك پزیشك گەیشتنە سەری و بۆیان چارە کرد. پزیشکی لای ئەمانە بە یەك مەرج دێنە وەرگرتن ئەویش ئەوەیە: هەموو هێز و توانایان بەکاربێنن بۆ رووتاندنەوەی گیرفانی خەڵك بۆ سەرفکردنی دەرمانی کۆمپانیای بەرپرسەیلی بازرگان، عەمەلیاتی سەقەتکردنی خەڵك. ئەگەر نەخۆشێك دوو جار پێویستی بە بینین بێ ئەوان ٢٢ جار دەیبینن تا سەرقاڵی بکەن و بیر نەکاتەوە. ئا ئەم پزیشکانە وەردەگیرێن چونکە شێوازی کارکردنیان لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای سەرانی شازلاند یەك دەگرێتەوە.

لەکاتی بەستنەوەی برینکەی دەستی وەك منداڵان دەنووزایەوە لەبەرئەوەی ئەو لەسەردەمی شاخ و سەر دوندان هێشتا نەهاتبووە دنیا و رەوەزێکی نەدی بوو. بەدەستی بە لەفافییەوە بانگی هەموو دارودەستەکەی کرد. هەموویان، بە پەیکەری شەرمەزاری و نەفس و ئەوانی تریشەوە، لەچاوتروکانێکدا لەبەردەمی وەستان. سەروسیما و تەواوی جەستەی پەیکەری گومان تەعبیریان تەنێ لە یەك شت دەکرد ئەویش رك و کینە بوو.

## ٢

لەبەردەمی ئەوان وەك پەیكەرێك لە رك وەستا بوو. دواتر لەگەڵ پەیكەری شەرمەزاری چوونە سەر سەكۆ و لەسەر كورسی دانیشتن. كورسییەكان بێ تاقەت و پڕ لە درز دەبوون كاتێ ئەوان لەسەریان دادەنیشتن. ئەو هۆڵەی ئەوان تێیدا كۆ بووبوونەوە بۆنی رك و كێمی لێ دەهات. لەو هەموو دەموچاوەی لە هۆڵە داخراوەكەدا بوون، دەموچاوێك نەبوو گەش و بە زەردەخەنە بێ. هەمووی مڕ و مۆچ و بۆز، وەك دەموچاوی ئەوانەی بەیانیان دوای بۆگەنبوونیان لە ناو پێخەف لای نیوەڕۆ هەڵدەستن و تا دوو سەعات وەك بەرازێكی غەزریو لەگەڵ دەوروبەر مامەڵە دەكەن. هیچیان بە سیاسەتوان، ژیر، وڵاتدروستكەر، دڵسۆز یان خەمخۆر نەدەچوون. باڵایان ناكاریزمی، قوت، قەڵەو، ئەو قات و ریباتە گرانبەهایانە نەبن تەنێ لە پیاوانی گوفەك دەچن.

"وەك دەزانن كۆمەڵێك ناپاك وڵاتیان پڕ كردووە لە كاغەز و شتی وا،" پەیكەری گومان، بەدەنگێكی شكستخواردوو دەستی بە قسان كرد.

"ئێوەم بانگ کردووە تا بزانین چۆن ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە بەزووترین کات دەسگیر بکەین."

پەیکەری شەرمەزاری، لە تەنیشتییەوە، سەری ئەرێنی بۆ با دەدا و قسەکانی هەر بەسەر دووپات دەکردەوە. ئەوانەشی کە لە دووری سێ مەترەوە لەسەر کورسییە سوورە قەتاربەستووەکان دانیشتبوون هێندە بەو دوو رستەیە خۆشحاڵ بوون وەك بڵێی لە ژیانی خۆیاندا قەت گوێیان لە هیچ نەبووبێ.

"با لەوە زیاتر کات بەفیڕۆ نەدەین، ئەوەی پێتان دەکرێ بیکەن بۆ دەسگیرکردنی دوژمنان،" پەیکەری گومان گوتی، دواتر مایکەکەی بەدەستی بەلەفافی گرت و فەرمانی کرد: "بڕۆن بیانگرن!"

## ٣

هێشتا دوا دوو پیتی دوا وشەی، بیانگرن،ی بەتەواوی گۆ نەکرد بوو، دارودەستە هەستانە سەر پێ، هێندە مشەوەش بوون، دوو دوو، سێ سێ بەریەك دەکەوتن. هەر کەس هەوڵی دەدا پێشی ئەوی تر بچێتە دەرەوە تا بچێ بەناو خەڵکەکە بکەوێ و بەدوای دوژمندا بگەڕێ، هێندە تامەزرۆی ئازاردان و شکاندنی کەرامەتی گەل بوون. فەرمانەکەیان هێندە لەلا پیرۆز بوو هێندە ئاینی خۆیان بەپیرۆز نەزانیوە و نازانن. هۆڵەکە ئەوەندە شڵەژا بوو نیوەی دەستوپێوەند لە بن دەست و پێیان کەوت بوون.

پەیکەری گومان، شەرمەزاری و نەفس و کاربەدەستانی تر بەخەنینێکەوە نیگایەکی دڕندانەیان سرەواندە یەکتری و لە دەرگەی تایبەتی خۆیان لە هۆڵەکەدا چوونە دەرەوە.

# ٤

٢٢ جێبی شەڕی پڕ لە نینجای عادی، کە تەپ و تۆزی دوای خۆیان غەدرێکی گەورەی لە ژینگەی شاری زیندووان کرد، بەسەر گەڕەکی داهێنەرانیان دادا. باشترین و قورسترین جۆری چەکیان پێ بوو وەك بڵێی هاتبنە جەنگی جیهانی سێیەم. تێچووی پارەی چەکەکان نەیدەکردە چارەگێکی تێچووی پڕۆژە ناتەواو و وەستاوەکانی شازلاند. چەکی گرانبەها و پڕۆژەی ناتەواوی خزمەتگوزاریی سەرەتایی هاوکێشەی دواکەوتوویی شازلاند دەسەلمێنێ:

***چەکی گرانبەها + پڕۆژەی ناتەواو = دواکەوتن***

## ٥

گەڕەکی داهێنەران شوێنی ئەو داهێنەرانەیە کە کەس حسێبیان بۆ ناکا. داهێنەر لەم وڵاتەدا پەنجە بۆ دووی سووری شاگەندەڵ مۆر نەکا داهێنەر نییە، بگرە خۆترپێنە. داهێنەران دەتوانن وڵات بەرەو پێش ببەن چونکە ئامادەن تەواوی تەمەنیان بۆ پێشکێشکردنی یەك بەرهەم سەرف بکەن. ئەوانن خەمخۆر و داینەمۆی راستەقینەی وڵات. لەباتی رێز و ستایش، بەرپرسەیل، تا بۆیان بلوێ، سووك، ریسوا و چاو شۆڕیان دەکەن.

ئەو داهێنەرانەی لەم گەڕەکەدا دەژین داهێنەری مەردن و نایەنە کڕین. ئەو داهێنەرانەی کە خۆیان فرۆشتووە بە موڵك و سامان لەم گەڕەکە جێیان نابێتەوە. داهێنەرێکی سیاسییان شەش ساڵ بزر کرد بەتۆمەتی ئەوەی رەخنەی لە بەڕێوەبەرێکی گشتی گرتووە بەوەی کە نەیتوانیوە خزمەتی خەڵك بکا. پلانێکی تازەی بەڕێوەبردنی دەخاتە بەردەم، کەچی لەباتی دەستخۆشی و پێزانین، زمانی لێ دەدا و فڕێی دەدەنە بەندیخانە تاریکەکانیان کە هیچ گیراوێك لەوێ نازانێ بۆ گیراوە.

## ٦

تەواوی داهێنەرەکانیان، بە پیاو و ئافرەتەوە، لە گۆڕەپانی ناوەڕاستی گەڕەکەکەدا کۆ کردەوە. ناچاریان کردن بکەونە سەر ئەژنۆ. لوولەی تفەنگیان لەسەر سەر دانا بوون. منداڵەکانیشیان بەجیا لە بازنەیەکی تەنیشتی گۆڕەپانەکەدا دانا بوو. گریان و بابە و دایەی منداڵەکان فریشتەکانی ئاسمانیان بێزار دەکرد. کتوپڕ منداڵێکی پێنج ساڵان، قژ کاڵی لول درێژ، چاوگەشی تژی لە بەڕائەت، توانی لە کونێکی تەلبەندی نینجا عادییەکان دزە بکات و بەرەو داییابی را بکات. دەستەڕاستی پەیکەری گومان، کە سەرپەرشتی هەر ٢٢ جێبە پڕ لە نینجاکەی دەکرد، فەرمانی کرد تەقە لە منداڵەکە نەکەن. ئەم هەلەی قۆستەوە، لێی گەڕا تا چووە لای داییابی. ئەوجا چوو منداڵەکەی لە باوەش کرد، جیای کردەوە و هێنایە بەرچاوی هەموان. دەمانچەی لەسەر سەر دانا:

"ئەگەر تا ٢٠ چرکەی تر پێم نەڵێن کێ کاغەز و نامە چەمکی دووی سوری بڵاو کردووەتەوە، ئەوا جارێکی تر ئەم منداڵە هەناسە نادات،" دەستەڕاستی پەیکەری گومان وای گوت.

ئاپۆرەکە مقۆمقۆییێکی گەورەی لێ کەوتەوە. هێندە گەورە بە نینجاکان کۆنترۆڵ نەدەکرا. دەستەڕاست دوو سێ فیشەکی بە ئاسمانەوە نا و دووبارەی کردەوە: "کات بەفیڕۆ مەدەن، ئەگەر پێم نەڵێن ئەوا دەیکوژم!"

نەك داهێنەر، هەر تاکێکی مەرد ناتوانێ لەخۆڕا ناوێك بڵێ یان تۆمەتەکە بخاتە پاڵ یەکێکی تر یانیش بەسەر خۆیدا بێنێ. بۆیە هەمویان بێ دەنگ بوون. لەگەڵ بیستەمین چرکە دڵڕەق و بێ بەزەییانە، وەك بڵێی جەرگی لە رك دروست کرا بێ، پلی پێوەنا و مێشکی منداڵەکەی پژاند. تەواوی داهێنەران، بە گەورە و بچووکیانەوە، تۆقین و تاسان بەم دیمەنە.

ئەم کارەساتە و دەیانی هاوشێوە راستەوخۆ لەسەر شاشەگەلی شاری زیندووان پێشان دەدران. پەیکەرەکان، خەم، جووڵە، نووسین، بازرگانی، خۆشەویستی، ئیمان و موزیك و ئەوانی تر بە دیمەنەکان کاتیان لەوپەڕی نیگەرانی و ناشادیدا بەسەر دەبرد.

"من خۆم ئاشکرا دەکەم، بۆ ئەوەی چی تر خەڵك نێتە کوشتن،" پەیکەری ئیمان بەدڵێکی پڕ لە خەفتەوە وای گوت.

"نەخێر من دەچم،" پەیکەری موزیك وای گوت.

"نا، من خۆم ئاشکرا دەکەم."

" نا من."

"نەخێر من دەچم."

٤

پەیکەرەکان یەك لەدوای یەك خۆبەخشانە ئامادەیی خۆیان دەربڕی خۆیان ئاشکرا بکەن تا کوشتارگەی روحگەلی بێ گوناھ بێتە وەستاندن. لەو قسانەدا بوون، شاشەیل دیمەنێکی تری قێزەوەنیان لە شاری مەستی گواستەوە. لە گەڕەکی ناندەران، کە کۆنترین گەڕەکی شارەکەیە و ئێستە چارەگێکی تێك دراوە و بووەتە گەراجی ئۆتۆمبیل و باڵەخانە، نینجا عادیییەکانی ژێر فەرماندەیی پەیکەری نەفس و پەیکەری شەرمەزاری بەربووبوونە گیانی کۆمەڵێك خەڵکی هەژار و نەدار و بێدەسەڵات.

"نەخێر، نابێ کەستان بچن. من خۆم سەرچاوەی هەموو ئەم گرفتانەم، من دەچم خۆم رادەست دەکەم،" پەیکەری جووڵە بەدەنگێکی بوێرانە و پیاوانە وای گوت.

"نا،" پەیکەری خۆشەویستی قیژاندی، دەستی بە گریان کرد و بەردەوام بوو: "براکەم لە دەست داوە، نامەوێ خۆشەویستەکەشم لە دەست بدەم."

پەیکەرەکان هیچیان بەوە رازی نەبوون. بەڵام پەیکەری جووڵە توانی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا قەناعەتیان پێ بکا کە ئەو لە هەموویان باشترە بچێ خۆی رادەست بکا.

"من لە هەمووتان باشتر دەتوانم قسە لەبارەی دووی سوور بکەم چونکە خۆم دامهێناوە،" ئەمە دواهەمین قسەی پەیکەری جووڵە بوو. دواتر پەیکەری خۆشەویستی لە باوەش کرد و لێیدا رۆیشت.

پەیکەری خۆشەویستی کەمێك لەخۆی دا و ویستی بەدوایدا بچێ، کەمێك نێسکەنێسکی کرد بەڵام پەیکەری نووسین گرتی.

"تکایە مەچوو، لێیگەڕێ با کارەکەی تەواو بکا،" پەیکەری نووسین بەدڵێکی پڕ لە برینەوە وای بە پەیکەری خۆشەویستی گوت.

پەیکەری خۆشەویستی لەسەر ئەژنۆ کەوت و گریانەکەی بە کووڵتر کرد.

پەیکەری جووڵە زۆر بەخێرایی خۆی گەیاندە گەڕەکی داهێنەران چونکە دەستەڕاستی پەیکەری گومان منداڵێکی تری جیا کرد بووەوە و ٢٠ چرکەی دابوو بە خەڵکەکە، ئەگەر پێی نەڵێن ئەویش دەکوژێ. هەژدەمین چرکە تەواو بوو، نۆزەدەش تەواو بوو، پەنجەی داگرت و ویستی بیتەقێنێ، دەنگێك لە دواوە هات.

## ٦

"بوەستە!"

دەستەڕاستی پەیکەری گومان ئاوڕی دایەوە بینی گەنجێکە بەرەو رووی ئەو دێ. وەستا. منداڵەکەش هۆڕ هۆڕ دەگریا لە ژێر چۆکی ئەو. پەیکەری جووڵە هاتە بەردەمی. بێ ئەوەی هیچ بڵێ تا گرتی مستێکی لە لووتی کابرا دا و خوێن فیسقەی کرد.

"دە بمگرن دەی، من ئەو کارەم کرد،" پەیکەری جووڵە، دوای ئەوەی یەك دەرزەن نینجا کەوتبوونە سەر دوای مستەکە، وای گوت.

پەیکەرەکان لە شاشەوە پەیکەری جووڵەیان بینی کە چۆن کەلەمچەیان کرد و بە لێدان بردیان. هەر هەموویان چوونە لای پەیکەری خۆشەویستی و دەستیان کرد بەدڵدانەوەی.

## ١

له ژێر زەمینێکی تاریک، له ناو ژوورێکی بچووکی تاریک، به بزمارێکی نیو مەتری له یەکێکی له دیوارەکانی ژوورەکه هەڵواسرا بوو. هەڵواسینەکەی لەخاچدان نەبوو به بزمارێکی گەوره مەچەك یان ناو لەپی راست و چەپی له دارێکدا بدەن و دواتر لەسەر شێوەی سەلیب بێته هەڵواسین. هەڵواسینەکەی ئەو جیاواز بوو: هەردوو ناولەپی دەستیان له سەرەوه لەسەر یەك به بزماره درێژەکه له دیوار کوتی بوو. له خوارەوەش قاچەکانیان هەر یەك بەلایەکدا بەرز کرد بووەوه و به بزمار قایم کرا بوون وەك بڵێی هەردوو دەستی له سەرەوه جووت کرد بێ و له خوارەوەش فەتحی کرد بێتەوه. له تاو ئازارەکانی دەیبزرکاند. ئەوانه بیانەوێ یەکێك ئازار بدەن، دەرزیئاژن سووکترین و سەرەتاییترین ئەشکەنجەیە.

کاربەدەسته باڵاکان نەبێ کەس نازانێ ئەو زیندانه له کوێیه. وتەیەك له شازلاند زۆر باو بوو له ناو کاربەدەستان:

***مرۆی مەزن دەبێ له زیندانی مەزندا بەند بکرێ.***

## ٢

زیندانەکە پیسترین و گەورەترین زیندانە لە شازلاند. کاربەدەستان هەردەم بە زیندانی مەزن ناوی دەبەن. ئەوەی لەوێ بەند بکرێ جارێکی تر خۆر نابینێتەوە. زیندانییەکان هەمووی لەسەر مەردایەتی گیراون. لە شازلاند کەس لەسەر نامەردی ناگیرێ.

مەرد هەیە دەرخواردی گورگ دەدرێ، هەیە دێو دەیخوا، هەیە ماری زەبەلاح قووتی دەدا. هەیە تیزابی لەسەر تاقیدەکرێتەوە، هەیە بۆ خۆشی فڕێی دەدەنە ناو کۆمەڵێك سەگی دڕندە کە بە نیو سەعات تاڵەموێك چییە، چ جای پێست و ئێسك، نامێنێ.

زیندانییە هەڵواسراوەکە، دوای ٢٢ سەعات لە بێهۆشی، سەری جولاند و چاوی بە ئاستەم هەڵهێنا. جێ پەنجەیەك نەبوو لەسەر جەستەی برین و مۆر نەبووبێ. لە دوورەوە بە پەیکەری برین دەچوو. هێندە لە کەللەی سەر و چاویان دا بوو، بینینی کز و لێڵ و بیرکردنەوەی کاڵ بووبوو. خوێن لە ژێر ئەژنۆی تك تك دەچۆڕایەوە و دەکەوتە سەر زەوی کە ڕەنگی سوورێکی ئاڵ و گەشی هەبوو. دیوارەکان سوور سوور بوون.

٣

"پەیکەری جووڵە گیان ئەوە لێرە چی دەکەیت، هەڵسە با بڕۆینەوەماڵ،" پەیکەری خۆشەویستی وای پێ گوت. ئەویش زەردەیەکی هاتێ و هیوای بە ژیان بووژایەوە. پەیکەری خۆشەویستی بزمارەکەی دەستی و قاچەکانی لێکردەوە و هێنایە خوارەوە. دواتر بە سپڕایەك، کە زۆر پێشکەوتوو بوو بۆ چاکردنەوەی برین، هەموو لەشی چاك کردەوە. پەیکەری جووڵە وەك جارانی لێهاتەوە وەك بڵێی هەرگیز لێی نەدرا بێ، هەڵنەواسرێ بێ و خوێنی لێ نەچۆڕابێتەوە. دوای مژینی لێو و زمانی یەکتر پەیکەری جووڵە پەیکەری خۆشەویستی لە باوەش کرد و بەپێکەنین و رووێکی گەش لە زیندانە تاریکەکەدا رێی چوونە دەرەوەیان گرت.

# ٤

دووی سوور، پەیکەری گومان، شەرمەزاری و نەفس، شاخبڕ، کاسپەر و کاك روکن هاتنە زیندانییەکە. جەلادەکە یەك پەقرەج ئاوی تەزی بە پەیکەری جوولەدا کرد. لە خەیاڵیدا دوو سێ هەنگاوی مابوو لە زیندانییەکە لەگەڵ پەیکەری خۆشەویسی بچێنە دەرەوە، بەڵام بە ئاوە تەزییەکە لەو خەیاڵە پچڕا و هاتەوە هۆش خۆی. کە چاوی هەڵێنا، بە ئاستەم دووی سوور و پەیکەرەکانی تری بینی. لە سوێی ئەوەی لە خەیاڵی پەیکەری خۆشەویستی دابڕا چەند تکە ئەشکێك لە چاوەکانی بەسەر روومەتە خوێناوییەکەیدا هاتە خوار. لەبەر خوێن دڵۆپە فرمێسکەکانیش خوێناوی بوون وەك بڵێی فرمێسکی خوێناوی بڕێژێ.

پەیکەری گومان رووە و دووی سوور گوتی: "تەماشای کە تازە پەشیمان دەبێتەوە و دەگری. ئەوە ئەو پیاوە گرینۆکەیە کە دەیویست ناوی بەڕێزتان لەکەدار بکا و وڵات بشێوێنێ. ئەوە بیری سەرەکی ئاژاوەکان بوو، هەر ئەو تەواوی پلانی داباریینی کاغەز و نامەکانی داڕشت بوو. بێگومان چەند کەسێکی تری لەگەڵ دایە

بەڵام تا ئێستە نەمانتوانیوە بیاندۆزینەوە و دەسگیریان بکەین. ئێستە تەواوی هێزەیل و نینجاکانمان بەدوایاندا دەگەڕێن."

دووی سوور دەستخۆشی لێکردن و تۆزێکی تر لە پەیکەری جووڵە نزیک بووەوە. ماوەییێك تەماشای کرد و دواتر پێی گوت: "چی وای لێ کردی دژی من بجووڵێیتەوە؟" رووی لێ وەرگەڕاند و بە دوو سێ هەنگاو گەیشتەوە لای پەیکەرەکان و بەردەوام بوو: "پێم بڵێ بۆ دژی وڵاتەکەتی؟"

## ٥

پەیکەری جوولە هەستوخوستی نەبوو، بڕستی لێ بڕا بوو، تەنێ تەماشای دەکردن. ویستی پێی بڵێ تۆ و داروستەدەکەت وڵاتتان خۆش ناوێ، ئێوە تەنێ بەدوای بەرژەوەندیی خۆتانەوەن. ویستی بڵێ ئەگەر پارە و موڵك و سامانی رەش نەبێ بەیانی هەر هەمووتان دەست لەکار دەکێشنەوە. ویستی بڵێ ئێوە چاوتان کوێر بووە، کەڕ و لاڵ بوونە بەرامبەر راستییەکان. ویستی دوو و شەو و دوو رۆژان تەنێ راستییەکانیان پێ بڵێ و ریسوایان بکا، بەڵام لەبەر لێدان و ئەشکەنجەدان دەنگەژێیەکان و زمانی پەکیان کەوت بوو. بەڵام توانی بەنیگاکانی ناڕەزاییەکان لە دووی سوور بگەیەنێ.

"چەندی تر دەژی؟" دووی سوور رووی لە پەیکەری گومان کرد و پرسی.

"ئەوپەڕی دوو رۆژی تر!" پەیکەری گومان بە زەردەخەنەوە، وەك بڵێی سەرکەوتنێکی مەزنی تۆمار کردبێ، وەڵامی دایەوە.

"باشە، نامەوێ کەس بەمە بزانێ و هیچی لەبارەوە بڵاو مەکەنەوە. بە هەموو بەڕێوەبەرانی شاشەکان بڵێ کە تەنێ سەما و

هەڵپەڕکێ لێ بدەن و شازلاند ئارام و خۆش و سەلامەت پێشان بدەن."

"بەڵێ گەورەم."

دووی سوور چووە دەرەوە و پەیکەرەکانیش یەك بەدوای یەکدا چوونە دەرەوە.

## ٦

پەیکەرەکان، نووسین، موزیك و ئیمان، بۆ دڵدانەوە چوونە لای پەیکەری خۆشەویستی. ئەوەی دواییان لە حاڵەتێکی زۆر خراپدا دەگوزەری. لەوەتەی پەیکەری جووڵەیان بردووە نان و ئاوی نەخوارد بوو. قژە خاو و درێژەکەی سیس و چڵکن بووبوو. چاوە گەش و نماوییەکەی لە هی دایکێك دەچوو چوار کوڕی بەیەك جار کوژرا بێ. جەستەی شەکەت و لاواز، لێوەکانی وشك و مۆر بووبوون. ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بووبا ئەوا رەنگ بوو دوو رۆژی تر لەگەڵ پەیکەری جووڵە گیانی دەرچووبا.

"تکایە وا لە خۆت مەکە، لەبەر خاتری ئەو قومە ئاوێك بخۆوە،" پەیکەری موزیك جامە ئاوێکی تا ئاستی دەمی پەیکەری خۆشەویستی برد و وای پێگوت.

"تکایە بەهێز بە، ئێستە ئەو بەو شێوەیە بتبینێ تەواو بنێس دەبێ، نابێ کۆڵ بدەی،" پەیکەری نووسین وای پێگوت.

پەیکەری ئیمان چووە تەنیشتی و دەستی لە ملی کرد و نێوچەوانی ماچ کرد. دواتر بەهەردوو دەستی نورانی روومەتەکانی گرت و رووی لەخۆی کرد و گوتی: "ئێمە دەبێ کارێك بکەین بۆ

ئازادکردنی ئەو، بەڵام بەبێ تۆ هیچمان پێ ناکرێ، تۆ ئێمەشت بێ تاقەت و ورە دەکەی. تکایە گورچ و تینێك بدە خۆت و هەر ئێستە دەبێ تێر نان و ئاو بخۆیت."

"تکایە بۆ پەیکەری جوولە بژی،" هەرسێ پەیکەر وایان بەپەیکەری خۆشەویستی گوت.

## ٧

دوای ئەوەی هەر سێ پەیکەر قەناعەتیان بە پەیکەری خۆشەویستی هێنا تێر نان و ئاو بخوا، گەڕانەوە لای پەیکەرەکانی تر کە لە گەڕەکی خۆڵ کولانەییێکیان دروست کرد بوو. لەوێ دەستیان کرد بە کۆبوونەوە. هەموو رێیەکیان تاتوێ کرد بۆ ئەوەی کارێك بکەن فشار بخەنە سەر دووی سوور پەیکەری جووڵە ئازاد بکا. پەیکەرەکان لەوە تێگەیشتن بۆچی پەیکەری جووڵە لە شاشەکان پێشان نادەن. مەرامی کاربەدەستان ئەوە بوو پرسی پەیکەری جووڵە لە بیر خەڵکی ببەنەوە و هەر خێرا لەناوی ببەن و کەیسەکە بزر بکەن. بۆ ئەوەی رای گشتی دروست بکەن وەك فشارێك بۆ سەر دووی سوور، دەبوایە کارێك بکەن رەوشی پەیکەری جووڵە لە ناو زیندان بە خەڵکی پێشان بدەن. لە خەڵکی بگەیەنن کە داهێنەری دووی سوور چۆن دەگوزەرێ لە زیندان. هەرچی سەریان هێنا و برد نەیانتوانی بگەنە رێگەچارەیەك.

"دەبێ روحی پەیکەری ئیمان بچێ وێنەی ئەو لە زیندان بگرێ و چەپاڵەی بدا،" پەیکەری خۆشەویستی، کە دیار بوو نان و ئاوی

خوارد بوو، له کولانەکه هاته ژوورەوه و بەدەنگێکی زرنگ وای به پەیکەرەکان گوت.

پەیکەرەکان، هەر هەموویان، خۆشحالّ بوون به بەشداریکردنی ئەو و بەخێرهاتنەوەیان کرد. شوێنێکیان لەسەری سەرەوه بۆ کردەوه.

"چۆن بتوانم ئەوه بکەم خانمەکەم،" پەیکەری ئیمان پرسی.

"چۆن توانیت قەناعەت به پەیکەری بالّ بکەیت هاوکارمان بێ، ئاواش دەتوانی کارێك بکەی روحەکەت بنێرییه لای پەیکەری جوولّه،" پەیکەری خۆشەویستی وەلاّمی دایەوه.

"دەلّێن تۆ دەتوانی هەندێ بخەویت و روحەکەت بنێری بۆ هەر شوێنێك بتەوێ،" پەیکەری بازرگانی پێی گوت.

"بەلاّم نازانم ئەو له کوێ بەند کراوه،" پەیکەری ئیمان، تەماشایەکی هەموانی کرد و گوتی.

"دەتوانی خەیالّ و موزیك بەکار بێنی بۆ زانینی شوێنەکەی،" پەیکەری موزیك وەلاّمی دایەوه.

## ٨

پەیکەری جوولّە نان و ئاوی لیّ حەرام کرا بوو. بەردەوام خویّنی لیّ دەتکا. بیّهیّز و بیّکەس لە زیندانیّکی تاریك هەموو رۆژیّ سیّ جار ئەشکەنجەیان دەدا، ئەویش بویّرانە و مەردانە ناوی کەسی نەدەدرکاند و هیچ قسەی بۆ نەدەکردن. ئەو شەوە کە ٢٠٢٢/٢/٢٠ بوو پەیکەری جوولّە لەسەر روحدان بوو. بەڵام روحی پەیکەری ئیمان بەفریای کەوت. بزماری دەست و قاچی دەرهیّنا و لەسەر زەوی دریّژی کرد. کەمیّك ئاوی دا پیّی. پاشان بە پەڕۆییّکی نەرم و گەرم و تەڕ برینەکانی سەر جەستەی پاك کردەوە. جارجار قومە ئاویّکی بەپەمۆ دەکردە ناو دەمی. دوای دوو سەعات پەیکەری جوولّە بەتەواوی هاتەوە هۆش خۆی و چاوی بەتەواوی کردەوە.

"من دەبینی، دەمناسیتەوە؟" پەیکەر ئیمان پرسی.

"تۆ لە جاران نورانی تری، تیشکیّکی زۆر نورانیت لیّ دەردچیّ، ئەمە چییە؟" پەیکەری جوولّە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی و پرسی.

"من روحی پەیکەری ئیمانم، هاتووم چارەسەرت بکەم و نەهیّلّم بمری،" روح وەڵامی دایەوە.

پەیکەری جوولە کەمێك قیت بووەوە و تەماشای پەیکەری ئیمانی کرد. ئەویش خێرا لە مەبەستی گەیشت و پێی گوت: "پاڵ کەوە، تۆزێك پشوو بدە، من ناتوانم لێرە رزگارت بکەم، بەڵام جارجار دەتوانم بێمە خزمەتت بۆ ئەوەی نەمری."

"ئەی پەیکەری خۆشەویستی، ئەو وەزعی چۆنە، دەبێ بە حاڵێکی زۆر خراپی سۆز و دڵشکاندندا تێپەڕ بێ."

"خەمی ئەوت نەبێ چونکە زۆر باشە. هاتنی منیش هەر بیرۆکەی ئەو بوو."

# ١

له ٢٠٢٢/٢/٢١دا، خەڵك وەك ڕۆژانی ئاسایی دەبوایە بچن بۆ سەر کار. زۆربەی کارەکان کاری حکومین. زۆربەی فەرمانبەران بەیانیان تا دەگەنە سەر کار لە دوو سێ ڕووداوی ئۆتۆمبیل دەگەڕێنەوە. هەر چۆنێك بێ بە پەلەپەل خۆیان دەگەیەننە شوێنی کار، کاتێکیش دەگەنە ئەوێ بێ کار تا کۆتایی دەوام دادەنیشن. بەڵام بەیانی ٢/٢١ جیاوازە. خەڵك دێنە دەرەوە لە ماڵ بەڵام ناچن بۆ سەر کار. هەر هەموویان بەدیار دیوارەکانی شەقام و باڵەخانەکان دادەنیشن و دەست بەگریان دەکەن. هەیانە شین و ڕۆڕۆیەتی، هەیانە بەهێمنی دەگری، یان سێ سێ چوار پسە پس دەکەن و شەق لە رانی خۆیان دەدەن.

ئەو بەیانییە هیچ ڕێگەیەك نامێنێ بۆ هامشۆی ئۆتۆمبیل. وەك بڵێی خەڵکی هەر هەموو شارەکان بۆ ناڕەزایی و خۆپیێشاندان هاتوونەتە سەر شەقام. لە ڕاستیدا ئەمە خۆپیێشاندان نەبوو، ئەمە وێنە و نووسراوەکانی سەر دیوارگەل بوون سەرنجی خەڵکیان ڕاکێشا. کەس ئاگای لە شاشەگەل نەما کە جارجار دەموچاو

دەگۆڕا بەڵام ناوەڕۆکی وتارەکان هەموویان باسیان لە یەك شت دەکرد.

## ٢

بار و ڕەوشی پەیکەری جوولە لە زیندان، لە یەکەم ساتییەوە تا دوێنێ شەو کە ڕوحی پەیکەری ئیمان لای بوو، هەر هەمووی بە فۆتۆ ستۆری لەسەر دیوارەکان نەخشێنرا بوون. وێنەکان لە تەك یەکتر ریز کرا بوون، هەر ریزێك چیرۆکێکی پەیکەری جوولەیان باس دەکرد لە ناو زیندان. چیرۆکی ئەشکەنجەدانی، چیرۆکی شەڕی دەروونی، چیرۆکی هەڵواسینەکەی، چیرۆکی برینەکانی سەر جەستەی، چیرۆکی ڕوحدان، چیرۆکی خەون و خەیاڵەکانی، چیرۆکی داهێنانی دووی سوور و دەستگیرکردنی، چیرۆکی بینینی دووی سوور و دارودەستەکەی، چیرۆکی بێبەشکردنی لە نان و ئاو و نووستن. هەندێ لە شاشە هەرە گەورەکانیش بە وێنەچیرۆکی پەیکەری جوولە داپۆشرا بوون. وێنەچیرۆکە خەمئامێزەکان شکۆی شاشەکانیان شکاند بوو.

## ٣

دوای ئەوەی روحی پەیکەری ئیمان پەیکەری جوولەی بەجێهێشت، پەیکەری ئیمان لای پەیکەرەکان بێدار بوویەوە. بینیان فلاشێکی گەورەی لایە. لەسەر کۆمپیوتەر تەماشایان کرد، بینیان روحەکە تەواوی ئەو وێنانەی گرتووە کە باس لە ژیانی پەیکەری جوولە دەکەن لە زیندان. هەر بەم شەوە، هەموو پەیکەرەکان وێنەکانیان چاپ کرد و لە هەر سێ شارەکەی شازلاند لەسەر هەموو دیوار و باڵەخانەیەك و شاشەیلی گەورە وێنەچیرۆکەکانیان هەڵواسی. پەیکەری ئیمان و پەیکەری موزیك بە سەمای روحانی و موزیکی دانسقە نینجای عادی و هێزەیلی سەپاندنی یاسایان سەرقاڵ کرد، پەیکەرەکانی تریش وێنەچیرۆکەکانیان هەڵواسی.

## ٤

کاتێ بەرپرسەیلی وڵات زانیان کەس نەچووەتە سەر کار و هەر هەمووی بەدیار وێنەچیرۆکەکانەوە تازیەی بۆ پەیکەری جووڵە داناوە. نینجای عادی و هێزەیلی چەکدار بەناو شار و کوچە و کۆڵانەکاندا بڵاو بوونەوە. بەهەر هەموویان وێنەکانیان لێدەکردەوە و دەدڕاند، بەڵام دوای لێکردنەوەی وێنەکان، دەستبەجێ هەمان وێنە لە شوێنی خۆی دروست دەبووەوە.

ئەمە گەورەترین پەرجوو بوو لە وڵات. ئەمجارە بەنزینیان بە وێنەکاندا کرد و ئاگریان لێ تێبەردا، وێنەکان ئاگریان نەدەگرت. ئەمەش سەری نەگرت. هاتن ئەمجارە هەرچی فیشەکی تفەنگیان هەبوو لە وێنەکانیان گرت، وێنەکان هەر هەمووی کون کون بوون، بەڵام دوای وەستانی تەقە، کونەکان پڕ بوونەوە و وێنەکان لە جاران جوانتر بوون. هەر وێنەیەکیان بدڕاندبا، دوو وێنە دەهاتەوە، هەر وێنەیەکیان سووتاندبا، چوار وێنەی تازە دروست دەبووەوە.

ئەمجارە ناچار بوون بەربوونە گیانی خەڵکەکە بۆ ئەوەی چی تر بەدیار وێنەکانەوە دانەنیشن. جەستەی خەڵك وەك بەردی لێهات بوو، هەرچەندی لێیان دەدان لە شوێنی خۆیان یەك سانتیم چییە

نەدەبزوان. بەگوللە دەرەقەتیان نەدەهاتن، هەستان بە قازیفە پۆل پۆل خەڵکیان دەکوشت. بەڵام وەك مێروو چەندە خەڵکیان دەکوشت چوار هێندە زیاد دەبوون. ئەوانەی زیاد دەبوون نەمر بوون، بە قازیفە و تۆپیش هیچیان لێ نەدەهات. پەیکەری جووڵە لە زیندان هێزێکی نەمر و بوێرییێکی ئێجگار بەهێزی بە خەڵك بەخشی بوو. دیمەنەکە لەسەرەوەڕا بە رۆژی حەشر دەچوو. خەڵك هەر هەمووی چوار مەشقی لێی دانیشت بوون و بەدیار وێنەکان دۆش داما بوون.

## ٥

پەیکەرەکان، نووسین، خەم، موزیك، ئیمان، خۆشەویستی، ترس، بازرگانی و بێدەسەڵاتی ئەمەیان بە هەلێکی گەورە زانی بۆ گەیاندنی پەیامی پەیکەری جووڵە، کە شەوی رابردوو هەمووی بە روحی پەیکەری ئیمان سپارد بوو. پەیکەری خۆشەویستی پەیکەرەکانی دابەش کرد بەسەر شوێنگەلی سەرەکیی هەر سێ شارەکە. سەعات ١١ی بەیانی هەر هەموویان پێکەوە دەستیان کرد بە پێشکەشکردنی وتار بۆ خەڵکی. هەموویان یەك وتاریان دەخوێندەوە. وتارەکە لە ژێر ناونیشانی "پەیکەری دووی سوور" بوو. تا ئەو کاتە زۆربەی زۆری خەڵك دووی سووریان بیست بوو بەڵام نەیاندەزانی بەتەواوی چییە و کێیە. ئەوانەشی نەیانبیست بوو لە وێنەکانڕا زانیان.

هەریەك لە پەیکەرەکان چوونە سەر شوێنێکی بەرز لە شوێنەیلی گشتی. سیفەتی نیوچە جنۆکەیان وەرگرت بوو. خەڵك ئەوانی دەبینی، بەڵام نینجای عادی و هێزەیلی چەکدار بەهەموو جۆرەکانییەوە، تەنانەت دەستوپێوەندی پەیکەری گومانیش ئەوانیان نەدەبینی. گوێیان لە دەنگێك دەبوو، بەڵام قسەکەریان

نەدەبینی. لەبەر دەنگی پەیکەرەکان وێنەکانیان بیر چوو بووەوە کە بەسەر دیوارەکانەوە هەڵواسرا بوون. وێنەکان سیفەتی درەختیان وەرگرت بوو، وردە وردە دەکشان و وەك لاولاو هەموو شوێنێکیان دادەپۆشی. تا وای لێهات یەك شاشە نەما هەر هەمووی وێنە داپپۆشتن. هیزەیلی چەکدار وڕ و گێژ بووبوون بەو دەنگەی کە دەهات و قسەکەریشیان نەدەبینی. بێزاریش بوون لە کوشتنی خەڵك چونکە چەندی بیانکوشتبا زیاتر دەبوون، بۆیە پەیکەری گومان فەرمانی کرد بوەستن لە کوشتن. ناچار ئەمجارە هەر هەموویان، ٧٥٠ هەزار چەکدار، لوولەی تفەنگیان لە ئاسمان کرد، هەرچی فیشەك هەیە بە ئاسمانیان وەنا. بەڵام دەنگەکان هەر نەوەستان. وەك شێتانیان لێ هاتبوو، جرپن جرپن بە هەموو لایەکی خۆیاندا فیشەکیان دەتەقاند. تا وای لێهات فیشەکی خۆیان بە زەلامی خۆیان دەکەوت و دەکوژران.

دووی سوور، کە لە ترۆپکی وڵاتی شازلاندا دەژی، کاتێ هاتە دەرەوە بینی وا نیوەی هێزەکانی بەدەستی هێزەکان خۆیان بەربوونەتەوە و مردوون. فەرمانی کرد لە تەقەکردن بوەستن.

## ٦

دەنگی پەیکەرەکان سافتر و باشتر دەبیستر‌ا دوای ئەوەی هێزەیلی چەکدار وەستان لە تەقەکردن. بەناچاری هەر هەموویان گوێیان لە وتارەکە بوو. وتاری پەیکەری دووی سوور تەنیٚ باسی دووی سووری دەکرد. ئەمەی خوارەوە تەواوی وتارەکەیە کە پەیکەری جوولّە بە روحی پەیکەری ئیمانی دابوو:

"هاولاّتیانی خۆشەویست، ریٚز و سلاّوی پەیکەری جوولّە و پەیکەرانی یاوەری قبولٚ بکەن. بویٚری و سەربەرزی لە زیندانەوە بۆ ئیٚوە. بیٚگومان تا ئیٚستە هەر هەمووتان دووی سوورتان بیستووە. لەوانەیە هەندیٚکتان کەمیٚك لە بارەی دووی سوورەوە بزانن، لەوانەشە نەیزانن. ئەم وتارە پوختە تەنیٚ باس لە دووی سوور دەکا. ئیٚمە دەمانەویٚ ئیٚوە چاوتان، گویٚتان و بیرتان بکریٚنەوە. چی تر بە وتارە درۆیینەکانی سەر شاشە قیٚزەوەنەکان دەستەمۆ و دەسخەرۆ نەبن. ئەو ئازارانەی ئیٚوە رۆژانە رووبەڕووی دەبنەوە هەمووی لە سایەی سەری دووی سوورە. هۆکاری ئەوەی ولاّتمان

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، لەباتی بۆ پێشەوە هەنگاو بنێ، دەچێتە دواوە، دووی سوورە.

من بەتەنێ پەیکەری جوولە نیم چی تر، ئێوە هەمووتان پەیکەری جوولەن.

دووی سوور کوڕی سەرۆکە کە بیست ساڵ پێش ئێستە مردووە. لەوەتەی سەرۆك مردووە پۆستەکەی تا ئێستەش بەتاڵە. تەنانەت ئەو تاقە کوڕەشی کە دووی سوورە پۆستەکەی پێ نەدراوە. دووی سوور گەورەترین کاربەدەستی وڵاتە. ئەو ١٢ کوڕی هەیە. پۆست حکوومی و ناحکوومی بەسەر کوڕەکانیدا دابەش کردووە. حکوومەتی ئێمە ٣٠ وەزارەتی هەیە. هەر کوڕێکی دووی سوور وەزیری شەش وەزارەتە، واتە لە یەك کاتدا شەش وەزارەت بەڕێوە دەبا چونکە خۆی کۆپی دەکا، دەتوانێ لە یەك کاتدا لە شەش وەزارەت دەوام بکا. پۆستەیلی دەرەوەی حکوومەت هەر هەمووی کوڕەکان بەریان کەوتووە. خۆی و کوڕەکانی لە یەك کاتدا هەم سیاسی و هەم بازرگان و هەمیش خاوەن میدیا و هەموو شتێکی ترن. سیستمی حوکمڕانی دووی سوور جیاوازە و لە تەواوی مێژوودا ئەزموونێکی لەم چەشنەی حوکم نییە و ناشبێ.

دووی سوور و دەستوپێوەندی حەز ناکەن ئەم وڵاتە گەنجی تێدا هەبێ. هەر جارە و بە بڕیارێك بەسەتان گەنجی ئەم وڵاتە لەناو

دەبەن و کەسیش هەست بەوە ناکا. دواهەمین بڕیاری دووی سوور ئەوە بوو لە وڵاتی سەیروسەمەرە جۆرێکی تایبەتی لە ئۆتۆمبیل بەڕادان دا. ئەم ئۆتۆمبیلە هەر چۆنێك پیێ لێ بنێی میلی خێرایی دەگاتە دوو سەت. ئۆتۆمبیلەکانی هێنا بە بەلاش تەنیا دای بە گەنج. بۆیە رووداوی ئۆتۆمبیل بەم دواییانە زۆر زیادی کردووە، ئەوەشی گیانی دەردەچێ گەنجە. پار بڕیارێکی دەرکرد کە هەر دەرمانێکی ئێکسپایەر پێشی فڕێ بدرێ دەبێ بدرێتە گەنجەیل. پێرار بڕیاری دەرکرد هەر چەکێکی نوێ بێ دەبێ یەکەم جار لەسەر گەنج تاقی بکرێتەوە. بۆیە ئێستە رێژەی گەنج لە وڵات زۆر کەم بووە. ئەوەشی ماوەتەوە هێڕ بووە، یانیش تووشی تیرۆری بیکردنەوە بووە.

دووی سوور پیاوێکی بەژن مامناوەند و خڕ و قەڵەوە. رووی رەش رەشە وەك بڵێی درۆ چارەی رەش کرد بێ. تا بڵێی رەزیلە، تا بڵێی لووتبەرزە، تا بڵێی کەللە رەقە و گوێ لە هیچ کەس راناگرێ. بەسەتان راوێژکاری هەیە بەڵام بە قسەی هیچیان ناکا، وای لێهاتووە راوێژکارەکان راوێژ بەو دەکەن. کارەکە پێچەوانە بووەتەوە، تەنانەت بۆ چوونە ئاودەستیش کەس ناوێرێ بچێ تا پرس بەو نەکەن. کاریزمای نییە. ئەگەر بێو لەگەڵ سەرۆکەیلی دنیا داینێی ئەو وەك فەقێیەك بەدیار دەکەوێ. زمانی خۆشمان بەتەواوی نازانێ، وتارەکانی بێسەروبەرن. کاتێ پرسیاری لێ

دەكرێ دەشڵەژێ و تێك دەچێ. ئەوەی درۆزن بێ كەیفی پێ دێ، ئەوەی دز بێ رایدەگرێ لای خۆی، ئەوەی نادڵسۆز بێ پۆستی دەداتێ، ئەوەی كاتی خۆی باوباپیرانی ئەم وڵاتەی كوشت بێ و زمانی لێدابن بەرزترین پۆستیان پێ دەدا.

تەنێ دۆستی نابەرپرسیارانە.

دووی سوور هەوێنی دواكەوتنی وڵاتە، سەرچاوەی وەستانی پڕۆژەكانە، موتوربەچی دز و ناپاكانە. وێڕای قۆرخكردنی تەواوی سامانی رەش، سەرانە لە هەرچی دوكاندار، بازرگان و خاوەن كار هەیە وەردەگرێ. هیچ پرۆژەیەك نییە بەشی ئەوی تێدا نەبێ. هەر سەرمایەدارێك لە دەرەوە دێ بە نیازی بنیاتنانی ژێرخانی وڵات، ئەو خۆی تێهەڵدەقورتێنێ و داوای پشكی سەتا ٥١ دەكا. ئێستە بیهێنیتە بەر دادگە لووتبەرزانە دەڵێ ئەو قسانە هەمووی بێ بنەمان لەبەرئەوەی كارەكان بەناوی خۆیەوە ناكا. دەستوپێوەند دەیكەن، چ زۆرە چەلاوخۆر و ناكەسبەچە زۆرن، ژمارەیان بەقەد خۆڵ دەبێ.

ئێوە دووی سوور نەگۆڕن و لا نەدەن لەسەر تەخت، هەرگیز بۆ خۆی واز ناهێنێ، ئەسڵەن هەر كەستان بە پیاو نازانێ. بۆیە لێرەوە پەیكەری جووڵە داواتان لێ دەكا ئیتر نامەردی قەبوڵ نەكەن، مەرد بن و چاو و گوێ و دڵ و بیرتان بكەنەوە. بیرتان نەچێ تەنانەت سەرۆكی ئۆپۆزیسیۆنیش لەم وڵاتەدا هەر كوڕی

دووی سوورە. لەوانەیە باوەڕ نەکەن، بەڵام سەرکردەی ئۆپۆزیسیۆن کوڕی دوازدەهەمیەتی.

ئێوە هەمووتان پەیکەری جووڵەن."

***پەیکەری جووڵە***

***زیندانی مەزن***

## ١

به جلی فۆلکلۆری شازلاند، که سێ پارچه قوماشه له مل تا ناو قەد، له ناو قەد تا سەر چۆك، لەوێشەوە تا گۆزینگ، هاتە سەر قەڵا. بەنێو خەڵکەکەدا هات که لەملاو ئەولایدا ریز بووبوون. وەك بڵێی بەچاوێکی سووك تەماشای زیناکارێك بکەن ئاوا خۆیان لێ مورِ دەکردەوە. وەك جاران خەڵك گوڵی تێنەدەگرت. لەباتی گوڵ، بەرد بارانیان کرد. تا گەیشتە شوێنی دانپیانان هەموو لەشی خوساوی خوێن بوو. ئەو رۆژە دادگەی کراوەی دووی سوور بوو. ئەو له شوێنێکی بەرز لەسەر قەڵا لەبەردەم گەلەکەی پێ له هەڵەکانی خۆی دەنێ و پەشیمانی خۆی رادەگەیەنێ.

ماڵەکەی له بەرزترین شوێنی شاری زیندووانه که پێی دەگوترێ بانەیلی سپی، کاتێ دێتە حەوشە و باخچەکەی هەر هەموو شارەکەی لێوە دیارە. له ماڵەکەیەوە تا سەر قەڵا خەڵك له راست و چەپ بەپەرۆشەوە وەستا بوون، وەك بڵێی وەستاون بۆ رەجمکردنی شەیتان، تا نەفرەت له دووی سوور بکەن. ئەو رۆژە کەس به هانایەوە نەدەهات. وەك جاران نەبوو نینجا عادییەکان و هێزەیلی چەکدار راست و چەپ، پشت و پێشی کۆنترۆڵ بکەن و

نەهێڵن کەس بیبینێ. وەك جاران نەبوو هەرکە ئۆتۆمبیلەکەی بوەستێ بیست کەس بەریەك بکەون بۆ کردنەوەی دەرگە. وەك جاران نەبوو کوڕەکانی لە پشتییەوە بن. وەك جاران نەبوو لەکاتی ڕۆیشتن ٢٢٢ ئۆتۆمبیلی ڕەش لە دواوە بڕوا و کەس نەزانێ لە ناو کامیانە. بەڵام هەر وەك جاران بە مۆنی تەماشای گەلەکەی دەکرد، بوودەڵە و بێهێز و پەڕپووت.

## ٢

له ڕۆژی پەشیمانیی دووی سوور، هەرچی دەستوپێوەند، چەلاوخۆر، جەللادی دەموچاو چەوتوچەوێڵ، ڕاوێژکار و پاسەوان هەبوو لە نێو خەڵکی ریز بووبوون. ئەوانیش وەك خەڵك بەردیان تێدەگرت. ئەوانەی کاتی خۆی چاوی کوێر کردبوون بە پارە و موڵك و سامان، ئێستە بوونەتە دوژمنی. ئەوانەی کاتیٚ خۆی هەر بە ئاماژەیەکی بەئاستەمی لاتیوە چاوی چی بویستبا بۆیان دەکرد.

کوڕەکانیشی هەمووی بەند کرا بوون.

بە زەلیلی و پەڕپووتی گەیشتە شوێنی دانپێدانان. هێندە پەشیمان بوو لە دوورەوە بە پەیکەری پەشیمانی دەچوو. خەڵك بەزەییان پێدا دەهاتەوە. ئەمەیە چارەنووسی هاوشێوە و شوێنکەوتوانی دووی سوور، جار لە هەر شوێنێکی دنیا بن. هاتە بەردەم مایکەکە و دەستی بە وتاری پەشیمانبوونەوە و دانپیانان کرد:

"من پەشیمانم."

کاتێ ئەم رستەیەی لە دەم هاتە دەر، گەلەکەی وەك جاران چەپڵەیان بۆ لێ نەدا، بگرە ئەم جارە هێندە تووڕە بوون دەیانویست هەر لەوێ لەتوپەتی بکەن. بەڵام، گەلەکەی وەك ئەو نەبوون و لێیگەڕان قسەکانی تەواو بکا. دووی سوور بە زەلیلی بەردەوام بوو:

"من هەڵە بووم."

دڵی خەڵك تەنیا بەم یەك دوو رستەیە ئاوی نەدەخواردەوە. گەل چاوەڕێی لێبوردن بوو. دووی سوور هەموو گیانی دەلەرزی و بەردەوام بوو:

"من داوای لێبوردن لە ئێوە دەکەم، تکایە بمبورن. بمبورن بۆ هەموو ئەو هەڵانەی من و کوڕەکانم و دەستوپێوەندەکەم رۆژێك لە رۆژان بەرامبەر ئێوەمان کردووە. من ددانی پێدا دەنێم کە شایستەی ئەو متمانەیە نەبووم ئێوە داتان بە من. شایستەی دەنگەیلی ئێوە نەبووم."

## ٣

گەل لە خۆشیاندا فرمێسک دڵۆپ دڵۆپ بەسەر روومەتیدا دەهاتە خوار. بەم داوای لێبوردنە برینەکانیان کەمێك ساڕێژ بوون. تەماشای یەکتریان دەکرد و دەیانگوت: "دوا جار خوا هەقی کردینەوە و هەق سەرکەوت."

دووی سوور، هەموو گیانی لە نێو ئارەقی رەش و شیندا نغرۆ بووبوو، بەشەرمەزارییەوە بەردەوام بوو:

"داوای لێبوردن دەکەم لێنەگەڕام بە ئازادی بژین، قسە بکەن و بیر بکەنەوە. داوای لێبوردن دەکەم نەمهێشت بە شکۆمەندی و کەڕامەت و سەربەرزی بژین. داوای لێبوردن لەو دایکانە دەکەم کە کوڕەکانیانمان کوشت، کچەکانیانمان زۆرەگێ کرد. داوای لێبوردن لەو شەهیدانە دەکەم کە خۆیان بەخت کرد تا ئێمە بتوانین وڵات دروست بکەین، بەڵام تەنێ وێرانمان کرد. داوای لێبوردن لە خانەوادەی شەهیدان دەکەم کە نەمتوانی خزمەتیان بکەم و فەرامۆشم کردن. داوای لێبوردن لە هەموو داهێنەرانی وڵات دەکەم کە نەمهێشت بەشدار بن لە دروستکردنی وڵات و هەردەم پشتگوێیانم خست. داوای لێبوردن دەکەم کە پەیکەری شکۆی

ئێوەم تێکوپێك شکاند. داوای لێبوردن دەکەم کە سووکم کردن لە دەرەوە، نەمتوانی کارێك بکەم ئێوەش وەك هاوڵاتیانی وڵاتانی تر شکۆ و پایەدار بژین."

٤

گەل، وەك جاران چەپڵەیان بۆ لێ نەدا، بگرە بەدانپیانانەکانی نزایان دەکرد لە خوای گەورە لەوێ لە زەویدا بیباتە خوار. گەل هێندە تووڕە بوو، هێندە دڵ بریندار بوو، هێندە بە مەراق بوو نەیاندەتوانی تەنانەت بیریش بکەنەوە لە دووی سوور ببورن. ئەویش زەبوون و بێ دەسەڵات بەردەوام بوو:

"پەشیمانم لەوەی وەك ئاژەڵ سەیری ئێوەم کرد. پەشیمانم ئێوەم بە پارە و سامان گۆڕییەوە. پەشیمانم ڕێم بە نینجا و چەکدارەکانم دا بەکەیفی خۆیان قڕتان بکەن. پەشیمانم نەمتوانی سەرۆکێکی باش بم. پەشیمانم ناوی باوکیشم پیس کرد. پەشیمانم لەوەی شازلاندم سووك و چرووك کرد. پەشیمانم لەوەی خۆم وەك فیرعەون لەوپەڕی خۆشیدا دەژیام و ئێوەش لەوپەڕی ناخۆشی و مەرگەساتدا. پەشیمانم لەوەی کوڕەکانم کردە هەموو شتێك و هەموو دەسەڵاتێکم پێ دان. پەشیمانم لە هەموو ئەو کارانەی کردوومن. داوای لێبوردن دەکەم."

ویستی بڕوا، بەڵام گەل هەموو پێکڕا هاواری کرد: "ئەی پێکدادانی ناوخۆ چی، ئەی چارەنووسی دیلەکان چی؟"

دووی سوور گەڕایەوە و دەستی پێکردەوە:

"هەقی خۆتانە لە هەر شتێك بپرسن. من ٢٢ مانگی تر لێرە بە شەو و رۆژ داوای لێبوردن بکەم ناکاتە نرخی روحی ئەو منداڵەی کە پێش گرتنی پەیکەری جووڵە مێشکیمان پژاند. هەقی خۆتانە. من و سەرانی تریش بەرپرسین لە پێکدادانی ناوخۆ. ئێمە ئاگرەکەیمان دایساند. ئێمە بە هەزاران گەنجی ئەم وڵاتەمان کردە قوربانی کورسییەکانمان. ئێمە بەرپرس و شەرمەزارین لەو پێکدادانە. من داوای لێبوردن دەکەم و پەشیمانم. راشکاوانە پێتان دەڵێم کە بەداخەوە دیلەکانی پێکدادانی ناوخۆمان کوشتن. هەر هەموویان بە گولله کوژران. ئێمە بەرپرسین و ئامادەین باجەکەشی بدەین."

هێشتا قسەکانی تەواو نەکرد بوو، دایانە بەر تەماتە و لینگە پێڵاوان. گەل تووڕە بوو کاتێ بیستیان دیلەکان نەماون چونکە دایبابی ئەو دیلانە تا ئێستەش هەر چاوەڕێیان بوون. پاشان دووی سوور، لەبەر تەماتەباران و لینگەپێڵاو بارانکردنی، هەر چۆنێك بێ گەڕایەوە لای مایکەکەی و گوتی:

"پەیکەری جووڵە هێشتا ماوە. ئەو نەمردووە. زیندووە. داوای لێبوردن دەکەم کە ئەم گەنجە مەردەمان گرت و ئازارمان دا. ئەو هەقی خۆی بوو ئەو کارانەی دەکرد."

گەل لە تەماتە هاویشتن و لینگە پێڵاوان وەستا کاتێ دووی سوور هەواڵی زیندوومانی پەیکەری جووڵەی پێدان. پەیکەری جووڵەیان بە قەرەبووێك زانی بەرامبەر بە کوشتنی دیلەکان!

## ٥

پەیکەری جوولّە هاتەوە هۆش، دوای ئەوەی ستلّە خێواوکێکی ساردیان بەسەر دەموچاو و جەستەی تژی لە بریندا کرد. بە سوێراوەکە لەو خەونەیان کرد کەوا دووی سوور لەبەردەم خەڵکی داوای لێبوردنی دەکرد و بەرامبەر بە گەل زەلیل و پەشیمان وەستا بوو. جگە لە دەستوپێوەند، سوودمەند و چەلاوخۆر و زوڕناژەنەکان، ئەم خەونەی پەیکەری جوولّە خەونی هەر تاکێکی شازلاندە. کە چاوی هەڵبڕی دووی سووری بینی، کە تووڕەیی و حەسرەتی نەدۆزینەوەی یاوەرانی پەیکەری جوولّە لێ دەباری. هەرچەندە بڕبڕەکانی ملی، لەبەر لێدان و ئەشکەنجەدان شل بووبوونەوە، نەیاندەتوانی سەری بەتەواوی راگرن، پەیکەری جوولّە سەری رێك و بەرز راگرت بەرامبەر بە رکابەرەکەی. دووی سوور گاڵتەی بەو گەنجە دەهات، بەڵام تەواوی گەل لە دەرەوە گاڵتەی بە دووی سوور دەهات.

## ٦

سیٚ نینجا، سیٚ چەکدار، پەیکەری گومان، پەیکەری شەرمەزاری، پەیکەری نەفسی خراپ، پەیکەری پارە و ڤێلا و سامانی رەش لە چوار دەوری پەیکەری جووڵە، کە بە دیوارەوە هەڵواسرا بوو، وەستا بوون. بەرامبەریشی دووی سوور بوو. هەر هەموویان، بەدووی سووریشەوە، بەبیٚ دەنگی سوورێکیان بە دەوری پەیکەری جووڵەدا لێدا. سوڕێکی دەروونی بوو. ویستیان یەکەم جار شەڕێکی دەروونی پیسی لەگەڵدا بکەن، ئەوجا قسەی لەگەڵدا بکەن. پاشان شاشەیەکیان هێنا کوشتن و بڕینی خەڵکەکەیان پیٚ پێشان دا. زیندانییەکە بەمە زۆر تێکچوو. ویستی دەست لە هەموو شتێك هەڵگریٚ، بەڵام لەپڕ روحی پەیکەری ئیمان هاتە بەرچاوی و تەواوی رەوشەکەی دەرەوەی پێشان دا.

"ناوی ئەو کەسانەمان پیٚ بڵیٚ کە لەگەڵتدا کار دەکەن،" دووی سوور یەك هەنگاو لێی هاتە پێش و بە دەنگێکی ترسێنەر وای گوت.

دوای چەند ساتێك چاو لەچاونانی، پەیکەری جووڵە، روحی پڕ لە بوێری، وەڵامی دایەوە: "ئەوان لە ناو شەقامەکاندان، تازە پەیامی

منیان لەبارەی تۆ بۆ هەموو گەل خوێندەوە، بڕۆن لەوێ دەستگیریان بکەن."

"باشە، چیت لە من دەوێ؟" دووی سوور، بە دەنگێکی بۆڕخواردووانە، پرسی.

"هەر ئێستە بڕۆ بەردەم دادگە و ددان بە تاوانەکانی خۆتدا بێنە، واز بێنە لە دەسەڵات و داوای لێبوردن لە خەڵکەکە بکە،" دەنگێکی بوێر و پڕ لە کاریزمای جاویدانی لە گەرووی پەیکەری جووڵەوە وای بە دووی سوور گوت.

دوای بیستنی ئەم قسانە، پەیکەرەکان ویستیان پەلاماری بدەن، بەڵام دووی سوور بەدەست ئاماژەی کرد بوەستن و وازی لێ بێنن چونکە بەرامبەر بەو بوێری و جەربەزەییەی سەری سڕما.

"ئەگەر نیشتمانت خۆش دەوێ، هەر ئێستە دەسەڵات لە کوڕەکانت وەرگرەوە وەك بڵێی گەنجینەیان دۆزیوەتەوە ئاوا بەربوونەتە گیانی ئەم وڵاتە،" پەیکەری جووڵە وای گوت.

"کێ لە شوێنی ئەواندا بنێم، کەس نییە!" دووی سوور وای گوت.

"تۆ پێت وایە بەس ئێوە پیاون. خەڵکی زۆر باشتر لە ئێوە هەیە و دەتوانێ وڵات دروست بکا. سەرۆکێك متمانەی بە گەلەکەی نەبێ هەردەم کوڕ و مام و دارودەستەی خۆی دەکاتە شت بەسەر گەلەوە. کوڕەکانی تۆ تەنێ لەبەرئەوەی کوڕی تۆن ئەو

پۆستانەیان هەیە، ئەگەر کوڕی تۆ نەبوونایە کەس وەك بۆیاخچیی پێڵاوانیش وەریان ناگرێ."

"من باشترین و شیاوترین کەسم بۆ گەل،" دووی سوور وای گوت.

"راستە، بەڵام ئەگەر رێ بە خەڵك بدەی ئازادانە بیر بکاتەوە، وا ناڵێن. تۆ تەنێ بەرژەوەندیی خۆتت لا مەبەستە. ئەگەر بێو بەیانی پارە و سامانەکانت لێ وەرگرنەوە، دووبەیانی یەکسەر دەست لە کار دەکێشییەوە چونکە پۆستەکەت بۆ خەمی خاك و وڵات وەرنەگرتووە بەڵکو بۆ گیرفان پڕکردن و سامان وەرگرتووە."

## ٧

دووی سوور بەم قسانە هێڵنجی دەهاتێ و زۆر پێیان تێکچوو. زانی دەرەقەتی نایەت. بەڵام پەیکەری جووڵە رێڕەوی پساند و گوتی: "خۆشترین شوێنت لە خەڵك داگیر کردووە. ئەگەر بەڕاستی وڵاتت خۆش دەوێ، ئەو شوێنە گەشتیارییە بدەوە بە گەل و بڕۆ کۆشکێکی نارنجی دروست بکە بۆ خۆت و ئەو سەرۆکانەی دوای خۆت دێن. تا کەی پۆستی سەرۆك بە بەتاڵی بمێنێتەوە، با هەڵبژاردنی ئازادانە بکرێ و سەرۆك بێتە هەڵبژاردن. با سەرۆکی هەڵبژێردراو بچێ لە کۆشکی نارنجی دابنیشێ. کۆشی نارنجی ناسنامەی وڵات دروست دەکا. تۆ کارێك ناکەی مێژوویی بێ و شکۆی وڵات لە دنیا بەرز بکاتەوە لەبەرئەوەی خۆت بە خاوەنی ئەم وڵات و میللەتە نازانی. هەر هەمووتان ئیقامەی وڵاتێکی ترتان هەیە، هەر بقەومێ، هەمووتان بەیەك چرکە بەجێی دێڵن."

"ئەمە بەسە،" دووی سوور لەسەری رژا و تەقییەوە، "ئێستە یەك پرسیاری ترت لێ دەکەم و وەڵامەکەشت دوا قسەت دەبێ. بۆچی بە من دەڵێی دووی سوور، بۆ دووی سوور؟"

پەیکەری جوولە کەمێك پێکەنی، دواتر گوتی: "دووی سوور واتە کیللی سوور کە لە کۆنکاندا وەرەقەیەکە. لە کۆنکان کیللی کوپە و کیللی دینار هەیە، جا تۆ کیللی دیناری چونکە تەنیا پارەت دەوێ، تەنێ بەدوای ئەڵماسەوەی. سیفەتێکی تریشی هەیە کیللی دینار: زۆر هیچ و پووچ و سووکە لە ناو یاری هەموو کەس فڕێی دەدا. کەس نایەوێت."

# ١

لە ٢/ ٢/ ٢٠٢٢دا، ئاپۆرەیەکی تووڕە لەسەر قەڵای شاری زیندووان کۆبوونەوە. قەڵای شاری زیندووان وەك ئێستە نەبوو: بژۆێن لە بەهاران و زەرد و وشك لە پایزان. قەڵا وەك جەستەیەکی خوساو لە تووڕەیی، تك تك تووڕەیی لێ دەچۆڕایەوە و سوور سوور بوو. دار، دیوار، زەوی، شەقام، تەنانەت دیواری مزگەوتی قەڵاش سوور بوو. ئەگەر بە کۆپتەرێك لە سەرەوە وێنەیەکی قەڵا بێتە گرتن، تەنیا رەنگی مۆر، سەوز، زەرد و سپیی ئاڵای شازلاند دەردەچێ، ئەوانی تر هەر هەمووی سوور دەردەچێ. ئەمەش لەبەرئەوەی رەنگی ئاڵا خاسەرەنگە و بزر نابێ. ئەگەر بیر لە ساڵانی هەشتاکان بکەیتەوە، قەڵا وەك دەریایەك لە تووڕەیی دێتە پێش چاو: تووڕەیی و خوێنی شەهیدان وەك بڵێی لە حەژمەتاندا مەییی بووبێ و قەتماخە لەسەر قەتماخ، چین چین قەڵایەکیان دروست کرد بووبێ. ئەگەر ساڵانی دوای راپەڕینیش بێنیتە بەرچاو، قەڵا وەك تۆپەڵە خوێنێکی کەوتووی دایك دەبێ وەك بڵێی شازلاندی لەبار چوو بێ یان لەباریان برد بێ.

نیوەی خەڵکی شاری زیندووان و دەوروبەری، سێچارەکی شاری مەستی و نیوەی شاری (مەنگ)یش لەسەر قەڵا شانبەشانی یەکتر سەر تا پێ جلی سوور دەپۆشن. بە خوێنی خۆیان نەخشەی شازلاند لەسەر دەموچاویان دەنەخشێنن. هەر لەسەر کۆپتەرەکە، خەڵکەکە وا دەردەکەون لە هەر دڵۆپە خوێنی شەهیدێکی مەرد مرۆییێك دروست بووبێ و دوو قاچی گرتبێ و هاتبێتە سەر قەڵا. قەڵا لە سەرەوە و لە دوورەوە بە شۆڕشی تووڕەیی خوێن دەچێ. هەر بابایە و بەرەو قەڵا رای دەکرد. هەیە گەیشتبووە دامێنی قەڵا، بەڵام هێندە قەرەباڵغ بوو نەیدەتوانی وەها ئاسان بچێتە سەرەوە، ئەوانەشی کە دەگەنە سەرەوە دەستبەجێ هەموو جلیان سوور دەبێ، نەخشەی شازلاند لەسەر روویان دێتە نەخشاندن. راستەوخۆ دەبن بە بەشێك لە تۆپەڵە خوێنەکە یان دەریاکە یاخود گەردەلوولێك لە تووڕەیی. شوێنێك نامێنێ لەسەر قەڵا، مرۆییێکی خوێنین و تووڕەیی تێدا نەبێ. قەڵا سیفەتی میزەڵان وەردەگرێ، چ میزەڵانێك، هەر چەند فووی تێبکەی نەتەقێ، قەڵاش وای لێ هات بوو، هەر ٩ ملیار مرۆیەکەی سەر رووی زەو بچووبا، لەوێ شوێنی دەبووەوە.

## ٢

نینجا عادییەکان، هێزەیلی چەکدار و پۆلیس، بە هەموو لك و پێکهاتەکانی، سەری لەوە دەرنەدەچوو ئاخۆ ئەو خەڵکە لەسەر قەڵا چیان دەوێ و بۆ وا دەکەن. هێزەکانی سەپاندنی یاسا، هەر هەموو داوودەزگاییێکیان، لە چوار دەوری قەڵا کۆ بوونەوە و قورسترین چەکیان ئاڕاستەی چیای خوێنین و تووڕەیی دەکەن. هەرچی دەنگ گەورەکەر هەیە بەکاری دەهێنن و هاوار دەکەن و دەڵێن "تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە."

هەر کەسێك یان شتێکی دەسەڵات لە قەڵا نزیك ببێتەوە، دەستبەجێ بە گەرمایی رەنگی سوور و گورزی تووڕەیی دەتوێتەوە. دەیانەوێ بە کۆپتەر بچن راستەوخۆ لەسەرەوە بنیشنەوە، کەچی کۆپتەر دەستبەجێ سوور دەبێ و دەتوێتەوە. پەیکەرەکان، ئیمان، خەم، نووسین، موزیك، ترس، بێدەسەڵاتی، خۆشەویستی و ئەوانی تر لە پێش پێشەوەی قەڵا بوون. تووڕەیی ئەوان گڕکانێك بوو وێرانکەر.

ئینجا عادییەکان و دەستوپێوەندی پەیکەری گومان بەهیچ شێوەیەك ناتوانن بچنە پێشەوە.

بۆیە هەر هەموویان لە دووری یەك کیلۆمەترەوە بە دەنگ گەورەکەر هاوارییان دەکرد: " تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە." ئەگەر لە ئاسمانەوە سەیری قەلا بکەی، هیچ نابینی، جگە لە گڕکانێکی سوور نەبێ، گڕکانێك تژی لە مرۆی سوور و توورە. فرمێسك، توورەیی، سوێ و هەنسکی مرۆگەلی سوور دەبێتە شلەی گڕکان و هەموو شتێك دەتوێنێتەوە.

# ٣

لەسەر قەڵا تەمەن نامێنێ، هەرچی لەوێیە تەمەنی ٢٥ ساڵ دەبێ، هەر منداڵێ، پیرێ، پیرەژنێك بگاتە ئەوێ، راستەوخۆ تەمەنی دەبێت بە ٢٥ ساڵ و سوور هەڵدەگەڕێ. غەریزە فیتڕییەکان نامێنن، کەس برسی نابێ، کەس تێنووی نابێ، کەسیش خەوی نایەت، کەس مەیلی سێکسی نامێنێت. تووڕەیی شوێنی هەموو ئەمانەی گرتبووەوە. ئاگری تووڕەییەکە بە هیچ ئاوێك ناکوژێتەوە.

لە ڕۆژی ٢٢ەمی ئاپۆرەکە، دووی سوور، گەورەترین کاربەدەستی ئەنجومەنی وەزیران، ئەندام پەرلەمان، هەرچی بەرپرس و کاربەدەست و دادوەر و حاکم و میری ئەم وڵاتە هەیە دێن لە دووری یەك کیلۆمەتر بە دەنگ گەورەکەر هاواریان کرد: تکایە با نوێنەرێکتان بێ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە."

"ئەگەر قسە هەتانە وەرنە ئێرە موخاتەبە بکەن،" ئەمە رستە بێسەروبەرە هی وەزیری نەزانی ژمارە ٧ بوو کە بەدەنگێکی ژنانە هاواری کرد.

هەواڵی ئەم قەڵایە سوورە بە هەموو دنیادا بڵاو بووەوە. کۆپتەرێکی تەلەفزیۆنی "بێنازان" و کۆپتەرێکی تەلەفزیۆنی

"خەیاڵ" و یەکێکیش هی "بی بی نێت" دەتوێتەوە دوای ئەوەی هەوڵ دەدەن لە ئاسمانەوە وێنەکە بگوازنەوە. هەرچی دەزگای ڕاگەیاندن هەیە لە دنیا، بە ئاژانسە زەبەلاحەکانیشەوە، لەوێ کۆ دەبنەوە و ڕاستەوخۆ قەڵای سوور لە دووری یەك کیلۆمەترەوە دەگوازنەوە بۆ هەموو دنیا. لەسەر شاشەگەلی دنیا ئەم دیاردەیە دەبێتە هەواڵێکی بە پەلە و سەردێری جۆرەوجۆر دەنووسرێ:

بە پەلە: قەڵای شاری زیندووان تووڕە دەبێ

بە پەلە: خەڵکی شازلاند لەسەر قەڵا کۆ دەبنەوە و ڕەنگی سوور دەپۆشن

بە پەلە: کەس نازانێ مرۆ تووڕەکانی سەر قەڵای سوور چییان دەوێ

بە پەلە: دووی سوور داوا لە مرۆ سوورەکان دەکا قسە بکەن

بە پەلە: قەڵای سووری زیندووان وەك گڕکان شت دەتوێنێتەوە

بە پەلە: سێ کۆپتەری میدیا دەتوێتەوە لەسەر قەڵای سوور

## ٤

شاشەگەلی شازلاند باویان نامێنیٚ. گەل لەسەر ڕێگەی خۆی بۆ قەڵا هەرچی شاشە هەبوو شکاندی. سەردەمی گوێگرتن لە شاشەکان بەسەر چوو. پەیکەری درۆ و پارە و چلێسی و گومان توانەوە.

قەڵای سوور نەك هەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بگرە لە هەموو جیهان دەنگی دایەوە و بووە جیٚ سەرنجی گشت سەرۆك، سیاسەتوانان، چالاکوانان، بازرگانان، نووسەران، ڕۆژنامەنووسان، ڕێکخراوگەلی مرۆی و ناحکومیی دنیا.

دووی سوور بە دەنگ گەورەکەرەکەی دەستی دیسان هاواری کردەوە: تکایە با نوێنەرێکتان بیٚ و قسە بکە تا بزانین داواکاریتان چییە. تکایە، ئەی خەڵکی بەشەڕەفی شازلاند پێم بڵێن چیتان دەویٚ، هەر چییێکتان بویٚ من ئامادەم جێبەجیٚ بکەم.

لە ناکاو، لافیتەیەکی سووری گەورە لە قەڵاوە بەرز کرایەوە. پەیکەرەکانی یاوەری پەیکەری جووڵە هەڵیان گرت بوو. بە گەورەیی بە ڕەنگی ڕەش لەسەری نووسرا بوو: ئێمە دەمانەویٚ داهێنەری دووی سوور لە زیندان ئازاد بکریٚ! هەروەها دەبیٚ زیندانی مەزن بێتە رووخاندن.

تەواوی هێزەکانی سەپاندنی یاسا، گەورە کاربەدەستان، تەنانەت دووی سووریش بێ دەنگ بوون و ناتوانن هیچ وەڵامێکی ئەم داوایە، ئەم پەیامەی مرۆگەلی سووری سەر قەڵای سوور بدەنەوە. ئەمە بووە سەردێری تەواوی میدیای جیهان. هەموو کەس لە دنیا دەپرسێ: "دووی سوور چییە، کێیە؟"

## ٥

لافیتەکە لێك دەکشێ و بەهەر چوار دەوری قەڵادا دەڕوا و دایدەپۆشێ. لەناکاو شاشەیەکی گەورە لە ناوەڕاستی قەڵا بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان. لەوێوە پەیامی پەیکەری جووڵە لەبارەی دووی سوور لەلایەن پەیکەری ئیمان دووبارە لێ دەدرێتەوە. ئەوسا هەموو دنیا تێدەگەن دووی سوور چییە و کێیە.

یەکێك لەسەری سەرەوەی پەیکەری تووڕەیی، لە هەموو لاشەی خۆی نووسیویەتی: ئێمە هەموومان پەیکەری جووڵەین. پەیکەری جووڵە هەرگیز نامرێ! پەیکەری موزیك موزیکێکی روحانی دەژەنێ. نەك هەر تەنێ شازلاند بگرە تەواوی دنیا بەم موزیکە دێنە جۆش و سەرخۆش دەبن.

دوای تەواوبوونی وتارەکە لەبارەی دووی سوور شاشەکە وردە وردە دێتە خوارەوە. پاشان پەیکەری خۆشەویستی بە دەنگ گەورەکەرێك هاوار دەکا: "هەر ئێستە پەیکەری جووڵە ئازاد بکەن، دوای پێنج خولەکی تر بڕیار نەدەن ئەوا هەر هەموومان بۆتان دێینە خوارەوە. جا ئەگەر وڵاتتان خۆش دەوێ، ئەگەر دەتانەوێ چی تر خوێن نەڕژێ، وەڵامێکی ژیرانە بدەنەوە."

دووی سوور و دەستوپێوەند، هەر هەموویان، سەریان دادایەوە.
لە یەکتر نزیك بوونەوە و چەند خولەکێك پسە پسیان کرد. بەڵام نەیانتوانی هیچ بڕیارێك بدەن. هەرکە پێنج خولەکەکە تەواو بوو، پەیکەری تووڕەیی تەقییەوە و شیلەی گڕکانەکە لە هەر چوار لاوە وەك تۆفان رژایە ناو مرۆگەلی خوارەوە. گەل بەتووڕەیی هاتە خوارەوە و هەرچی هاتە پێشی، رایماڵی.

## فەرهەنگۆك

### ئـ

ئاپۆره: قەرەباڵغی، کەڕەسیسەی خەڵك

ئاگرپاره: بزێو، سەرهار، بزۆز، زیت

ئالۆش: خورشت

ئاوەز: هۆش

ئەستێرەبەندان: تەنرانی ئاسمان بە ئەستێران

ئەلها: مگێز

ئیراك: ئەو دارەیە کە دار سیواکی لێ دروست دەکرێ.

ئیرۆتیك: هونەری رووتەمەنی

### ب

بابوێر: کونەبا

باڵەفڕگە: فڕۆکە، تەیارە

باراندیتە: دنیادیتە، بە ئەزموون

بزڕکاندن: وڕێنەکردن

بژوێن: سەوزەلان

بسکە: بزەی خۆشی

بنێس: سیس و دەردەدار

بووری: رابردوو

بۆڕخواردن: دۆڕاندن

بەدووم: شووم، نەحس

بەلەسە: یاخی و نائارام (ئاژەڵ)

بەندەن: شاخوداخ

بێتووك: خەفەتبار

### پ

پرێسکە: بوخچە بۆ هەڵگرتنی شت تێیدا

پلوورە: کوورەی هەنگ

پساندن: پچڕاندن، دابڕاندن

پەتۆ: هەناسە

پەڕپووت: شڕ و شپڕێو

پەرجۆ: موعجیزە

پەسار: پەنا

### ت

تاتا: تاڵ تاڵ

رۆپك: لووتکە

تژی: پڕ

تەوێڵ: ناوچەوان

تەناهی: ئاسایش

تیرێژ: تیشکی خۆر

تیژباڵ: خێرا لە فڕین

ج

جاویدانی: نەمر

جرپن: کەسی سەرشێت و بێ ئۆقرە

چ

چاونماوی: چاوتەڕ

چەپاڵەدان: داڵدەدان، پەنادان

چەپەك: شوێنێك هاتووچۆی بەسەرەوە نەبێ، کەوێڵ

چەوتوچەوێڵ: خوار و خێچ

خ

خاسەڕەنگ: ئەو ڕەنگەی ڕەش نابێتەوە

خوناوکە: نەرمەباران کە پشکی ورد وردە

خەزەڵ: گەڵای زەردی پایزان

خەمیژگە: سووکەخەم

د

داکردن: بارانی بەخوڕ

دوند: ترۆپکی چیا

دەرزیئاژن: بە دەرزی کون کونی بکەی

دەسندەخۆر: چاولەدەست

دیرۆك: مێژوو

دایباب: دایك و باوك

دێوەرە: دەسگێڕ

ر

رچە: باریکەڕێ

رۆندك: فرمێسك

روالّ: روو ئالّ، هەرزەکار

رژد: جدی

رەوەز: کەپکەشاخ

ز

زەندەقچوون: ترسان، زراوچوون

زراڤ: باریك

زڕتەك: فشەکەر

زاحۆرت: زڕتەزەلام

زنە: کانیلەی بچووك

**س**

سەربەمۆر: سەرمۆر، دەسلێنەدراو

**ش**

شابسك: بسكی سەرخڕی گەورە

شاقەڵشۆڕ: كراسشۆڕ، داوێنشۆڕ

شلك: ناسك

**ف**

فۆتۆستۆری: وێنەچیرۆك، بە وێنە چیرۆكێك باس بكرێ

**ڤ**

ڤەكردن: كردنەوە

**ق**

قامك: پەنجە

قەتاربەستن: ریزبەستنی لەدوو یەك

**ك**

كەسانی: شەخسی، كەسی

كاژێڕ: شەویلاك

كژ: وەرزی ساڵ

کەڤر: بەرد

کێماسی: کەموکوڕی

## گ

گەمبۆڵ: سەگی پیر

گەوز: تلدان

## ل

لەنگەرگرتن: وەستان لە هەوا

لەداردان: لەسێدارەدان

لەعل: بەردێکی سووری گرانبەها

لێ: بەڵام

لێوە: شێت

## م

مەفتەن: نیشتمان

## ن

ناشنا: نابەڵەد

نێسکەنێسک: سەمای ئەسپ، لەنجەولاری ئەسپ

ھ

ھەدادان: ئارامگرتن

ھەنیە: ناوچەوان، تەوێڵ

ھەرامە: ھین

ھەوك: ئەوك، قوڕگ

ھوما: لە ئەفسانە کۆنەکاندا دەڵێن بەو باڵندەیە گوتراوە کە لەسەر شانی ھەر یەکێك نیشتبایەوە دەکرا بە پاشا

## بەرهەمەیلی چاپکراوی نووسەر

### دانان

| | ناوی کتێب | بابەت | نۆرەی چاپ | دەزگای چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | شاخوێنبەری سەرکردە | رۆمان (چاپی یەکەم و دووەم– ٢٠٠٥ و ٢٠١٠) | چاپی یەکەم (٢٠٠٥) چاپی دووەم (٢٠١٠) | نازە |
| ٢ | ترس و رق | رۆمان | چاپە ئینگلیزییەوەی ٢٠١٠، چاپە کوردییەکەی ٢٠١٣ | پەبلیش ئەمێریکا– موکریانی |
| ٣ | دووی سوور | رۆمان | چاپی یەکەم ٢٠١٣ | موکریانی |
| ٤ | LG | فەرهەنگ | ئینگلیزی–ئینگلیزی– کوردی | سایە |

### وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە

| | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | دەزگای چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هاملێت | شانۆ | شکسپیر | تەفسیر |
| ٢ | ئەو ئایدیانەی دەستیان بە سەر جیهاندا گرت | سیاسی | مایکڵ ماندلبۆم | موکریانی |

| ٣ | گەندەڵی و حکومەت | ئابووری و سیاسی | سوزان ئەیکەرمان | ئاراس |
|---|---|---|---|---|
| ٤ | رۆبن هۆد | رۆمان | لیز ئۆستن | نازە |
| ٥ | دایانا | رۆمان | کێری گیلکرایست | نازە |
| ٦ | زێدان و نهێنییەکانی | وەرزشی | ئامادەکردن | سیما |
| ٧ | شەهیدانی وێڵ | لێکۆڵینەوە | یودیت نورینك | ئاراس |
| ٨ | تیۆری سیاسی | سیاسی | ئاندرو هێیوود | ئاراس |
| ٩ | بانەکانی وێزەرینگ | رۆمان | ئیمیلی برۆنتێ | ئاراس |
| ١٠ | ئۆکسفۆردی وێنەیی (فەرهەنگ) | فەرهەنگ | زانکۆی ئۆکسفۆرد | سانا |
| ١١ | ونبوون لە ونیدا | لێکۆڵینەوە | یودیت نورینك | ئاراس |
| ١٢ | داهێنانەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی | سیاسی و کۆمەڵایەتی | دەیڤد جی گرین | ئاراس |
| ١٣ | مێژووی هۆیەلی گەیاندن | رۆژنامەوانی | ئێرڤینگ ڤانگ | ئاراس |
| ١٤ | چۆن ئافرەت خیانەتی لە ئافرەت کرد | کۆمەڵە وتار– ئافرەتان | کۆمەڵێك وتارنووس | هێڤی |
| ١٥ | تێگەیشتن لە رۆژنامەوانی | رۆژنامەوانی | لینت شێریدان | ئاراس |
| ١٦ | نامیلکەیەك بۆ رۆژنامەنووسان | رۆژنامەوانی | رۆژنامەنووساذ ی بێ سنوور | ئاراس |

| ١٧ | رۆژنامەوانیی پیشەیی | رۆژنامەوانی | کۆمەڵە وتار | ئاراس |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | بەهاری عەرەبی | لێکۆڵینەوە | حەمید دەباشی | ئاراس |
| ١٩ | جووەکانی کوردستان | مێژوو | ئۆرا شێرتز بێیری | ئاراس |
| ٢٠ | کامە سوترا | سێکس | کامە سوترا | ---- |
| ٢١ | چیرۆکی شارستانیەت | مێژوو | ویل دیورانت | موکریانی |
| ٢٢ | بەنێودەوڵەتیکردنی پرسی کورد | سیاسی | کریس کۆچیرا | ئاراس |
| ٢٣ | راپۆرتی ساڵی ٢٠٠٧ | رێکخراوی KYEO | لە کوردییەوە بۆ ئینگلیزی | نازە |
| ٢٤ | راپۆرتی ساڵی ٢٠٠٨ | رێکخراوی KYEO | لە کوردییەوە بۆ ئینگلیزی | نازە |